زانكۆی هەولێری پزیشكی
HAWLER MEDICAL UNIVERSITY
CREWH
Center for Research & Education in Women's Health
سەنتەری توێژینەوە و فێرکردن بۆ تەندروستی ئافرەتان



# دادڕینی بنداميٚن و زامداریی بنداميٚنی منداڵبوون



## کتێبێك بۆ مامانەکانی کوردستان

د. حمدیە میرخان احمد
د. ئارتەر سەنیتوس
د. کەژان ابراهیم محمود
د. ئەڤین فتاح حاجی مام
د. تیران جمیل پیرۆ
م. واحیدە عبداللە ابراهیم

هەولێر ٢٠٢١

# دادڕینی بندامێن

# و

# زامداریی بندامێنی منداڵبوون

کتێبێک بۆ مامانەکانی کوردستان

هەولێر 2021

ناوی: دادڕینی بندامێن و زامداری بندامێنی منداڵبوون

بابەت: تەندروستی، پزیشکی

نوسەر و وەرگێڕ: حمدیه میرخان احمد

نارتەرسەنیتوس

کەژان ابراهیم محمود

ئەڤین فتاح حاجی مام

تیران جمیل پیرۆ

واحیده عبدالله ابراهیم

چاپخانە: چاپخانەی هەڤاڵی هونەری

ژمارەی سپاردن: لەبەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
ژمارەی سپاردنی (٨٩٨) ساڵی ٢٠٢١ پێدراوە

# نووسەران

**د حمدیە میرخان احمد، سەرنووسەر**
پرۆفیسۆر
دکتورا لە پەرستاری ئافرەتان
زانکوی هەولێری پزیشکی

**د ئارتەر سەنیتوس**
پرۆفیسۆری یاریدەدەر
لە توێکاری کلینیکی
ئاکادیمی زانستی پولەندی ، زانکۆی ئادالاید

**د کەژان ابراهیم محمود**
ماموستا
دکتورا لە مامانی
زانکوی هەولێری پزیشکی

**د ئەفین فتاح حاجی مام**
ماموستا
دکتورا لە مامانی
زانکوی هەولێری پزیشکی

**د تیران جمیل پیرۆ**
پرۆفیسۆری یاریدەدەر
دکتورا لە پەرستاری ئافرەتان
زانکوی هەولێری پزیشکی

**م واحیدە عبدالله ابراهیم**
ماموستای یاریدەدەر
ماستەرلە پەرستاری ئافرەتان
زانکوی هەولێری پزیشکی

# پێشەکی

مامانی پیشەیەکە بە زانیاری و زانستێکی جیا و مەودا و ڕێسای ڕەوشتی و ستانداردەکانی کاری تایبەت بە خۆی. مامانی بناغەیەکی پتەوی لە زانیاری و کۆمەڵێك شارەزایی تێدایە بۆ ئەوەی خزمەتگوزاریی دایکایەتی تەواو پێشکەش بە ئەو ئافرەتانە بکات کە منداڵیان دەبێت. مامانی لە هەرێمی کوردستانی عێراق وەك یەکێك لە دیسپلینە ئەکادیمییە گرنگەکان ناسێنراوە. مامانی بەو شێوەیەی ئێستای لە هەرێمی کوردستان پێویستیی زیاتری بە زانیاریی پشتبەستوو بە بەڵگە و ڕێنمایی کرداری هەیە و بە تایبەتیش بە زمانی دایکیان (زمانی کوردی). مەبەست لە ئەم کتێبە بریتییە لە پێشکەشکردنی ڕێنماییە دیاریکراوەکان بە زمانی کوردی بۆ ئەو مامانانەی لە هەرێمی کوردستاندان. ئەم کتێبە کردە و کێشە باوەکانی ماوەی منداڵبوون لە نەخۆشخانەکانی منداڵبوون دەخاتە روو و روونیان دەکاتەوە. کردەی دادڕینی بندامێن (Episiotomy) بە ڕێژەیەکی بەرز لەلایەن مامانەکانەوە ئەنجام دەدرێت و لە کاتێکیشدا دڕانی بندامێن (perineal laceration) کێشەیەکی باوی کاتی منداڵبوونەوە تووشی ملیۆنان ئافرەت دەبێت لە جیهاندا. ئامانجی سەرەکیی ئەم کتێبە ئەوەیە کە هۆکارەکان دیاری بکات، پرۆتۆکۆلەکانی چارەکردن هەڵبسەنگێنێت و ئەو ڕێگایانە دەستنیشان بکات کە دەبنە هۆی کەمکردنەوەی دڕانی بندامێن. بابەتی ڕێگریکردن لە کۆست و برینی سەختی بندامێن و ئاکامەکانی پرسێکی حەتمی و ناچارییە، بەڵام ئەوەی کە چۆن دەکرێت ئەم ڕێگرییە بکرێت، زۆر روون نییە. هەروەها، چاودێریی پاش دڕان بۆ دایکان بۆ ماوەی دوای منداڵبوونیان (زەیستان) پێویستیی بە پرۆگرامی بنەڕەتیی پەروەردەیی هەیە. نوسەران کتێبەکەیان لە زانیاریی پشتبەستوو بە بەڵگە کۆکردووەتەوە کە چەند پرسێك دەگرێتەوە وەك خاڵەکانی دەستنیشانکردن و، توێکاری و، فیسۆلۆژی نەخۆشیزانی و، چارەکردن و ڕێگریکردن لە کۆستەکانی منداڵبوون. بانگهێشتی مامانەکانی کوردستان دەکەین سەرنجی خۆیان لەسەر ئەم کتێبە بدەن لە ڕێگەی پەیوەندیکردنی بە سەرنوسەری کتێبەکە لە ڕێگەی ئەم ئیمەیڵە: hamdia76@gmail.com.

# پاڵپشتنامە

جێی خۆشحاڵیمە کە پزیشکی نەخۆشی ئافرەتان و منداڵبوونم و داوام لێ دەکرێت پاڵپشتینامەیەک بۆ ئەم کتێبە بنوسم کە لە لایەن نوسەرانی پیشەیی و ئەکادیمی نوسراوە بە مەبەستی پێشخستنی زانیاریە تیۆرییەکان و شارەزاییە کلینیەکانی مامانەکان سەبارەت بە کۆسی بندامێن. هەمیشە باوەڕم وەها بووە کە خزمەت و چاودێریی پیشەیی و هاریکارییانەی دوولایەنەی نێوان مامانەکان و پزیشکانی ئافرەتان پێوەرێکی زێڕینە لە چاودێریی دایکایەتیدا بۆ باشترکردنی هۆشیاری لەبارەی چاودێریی تایبەت بۆ منداڵبوون و هەروەها وەك باشترین رێگا پێشنیار کراوە بۆ چارەکردنی قەیرانە چاوەڕوانکراوەکانی چاودێریی دایکایەتی. کۆستی بندامێن لە دوای منداڵبوونی سروشتی لە رێی زێوە کێشەیە بۆ ئەو ئافرەتانەی منداڵیان دەبێت و رەنگە ناکامی ئەرێنیی کورتخایەنی جیدی و نەخۆشیی جەستەیی و دەروونیی درێژخایەنی بەدوادا بێت. مامانەکان شارەزا و پسپۆری منداڵبوون و چاودێریی دوای منداڵبوونن هەم بۆ دایکەکە و هەمیش بۆ منداڵەکە. رۆڵی ئەوان لە منداڵبووندا زۆر گرنگە بۆ ئەوەی دایکەکە و کۆرپەلەکە لە دۆخێکی باشدا بن. ئەم کتێبە کە بە شێوەیەکی وورد و کورت و پوخت و بە شێوازێکی زانستیی سەردەمیانە نوسراوە یارمەتیدەر دەبێت بۆ بەرەوپێشبردنی زانیاری و شارەزاییە پزیشکییەکانی مامانەکان و بە شێوەیەکی دیاریکراوتریش بۆ رێگریکردن لە روودانەی داڵەتەکانی دڕانی بندامێن و بۆ یارمەتیدانی دایکانی نۆبەرە کە چۆن چارەی حاڵەتەکانی دڕانی بندامین بکەن لە دوای منداڵبوون لە رێگەی جێبەجێکردنی رێنمایی و ئامۆژگارییەکانی پەیوەست بە برینەکانی ناوچەی بندامێن.

**پرۆفیسۆر د ناریانا خالص جواد**

سەرۆکی دەستەی کوردستان بۆ پسپۆڕییە پزیشکیەکان

سەرۆکی کۆمەڵەی پزیشکانی نەخۆشییەکانی ئافرەتان و منداڵبوون لە کوردستان - عێراق

# پاڵپشتنامە

پێویستییەكی ڕاستەقینە هەیە بە زانیاریی گونجاو بۆ پڕكردنەوەی پێداویستییە پەروەردەییەكانی مامانەكان لە گشت ئاستێكدا و بە تایبەتی لە هۆڵی منداڵبوون بۆ ئەوەی ڕێژەی كۆستی بنداميَن (perineal trauma) و كاریگەرییەكانی دادڕینی بنداميَن (iatrogenic episiotomy) كەم ببنەوە. كاری سەختی ئەو كەسانەی كە ئەم كتێبە بچوكە بۆ مامانەكان بەرهەم دەهێنن؛ ئەو بەشە چالاك و گرنگەی كارمەندانی تەندروستی لەسەر ئەو بیرۆكەیەن كە فێربوون كەم بەها دەبێت ئەگەر ماددە و كەرستە بەردەستەكانی فێربوون و فێركردن لە ئاستێكدا نەبن كە هاوتای ناوەڕۆكە پێشكەوتووەكان بێت. خۆشحاڵم كە ئەم پاڵپشتنامەیە بۆ ئەم كتێبە دەستییە نایاب و باش دیزاین كراوە دەنووسم كە كەسانێك دایاننـاوە و پەرمیان پێ داوە كە ڕاستەوخۆش پەیوەندیدارە بە مامانەكانەوە. پەیڕەوی لە ڕاستییە دەكات كە هەموو كتێبێكی دەستی پێویستە ڕووبەڕووی ئەو ئاڵنگار و تەحەدایە ببێتەوە كە دەبێت گشتگیر، بەڵام كورت و، بە باشی شرۆڤەكراو بێت و جەخت بخاتە سەر دەرخستە كلینیەكان و ستراتیژەكان ڕێگریكردن و خۆپارێزی. ئەم كتێبە تەنها ئەوە ئەنجام دەدات و بە دەست دەكەوێت و بە ئاسانی بەكار دەهێنرێت. دەكرێت ڕێك هەمووی بخوێنرێتەوە یان چڕ بكرێتەوە سەر بەشە دیاریكراوەكانی كێشەكان. چەند بەشێكی بەنرخی تێدایە لەسەر نیشانە توێكارییە كلینیەكان و، چەند بابەتێكی تێدایە لەسەر دادڕینی بنداميَن و كۆستی بنامێن لە بڵاوكراوەكانی ناوچەی خۆماندا و، هەروەها بەڵگەكان نوێ و ئەپدەیت دەكاتەوە لەسەر ئەم كێشە كلینیكیە گرنگە و، ڕێنمایی بەسوودی تێدایە لەسەر ئامۆژگارییە كردەییەكانی چاودێریی تەندروستی.


**پرۆفیسۆر شەهلا كریم ئەلعەلاف**

بەشی نەخۆشیەكانی ئافرەتان و منداڵبوون (OBGY)

كۆلێژی پزیشكی / زانكۆی هەولێری پزیشكی

پێرست

لە سەرانسەری جیهاندا، لە ساڵێکدا نزیکەی ١٤٠ ملیۆن ئافرەت منداڵیان دەبێت.

لەگەڵ ئەوەی کە زانیاریی زۆر هەن لەسەر بەڕێوەبردنی کردە پزیشکییەکانی تایبەت بە ژانگرتن و منداڵبوون، بەڵام بایەخێکی کەمتر دەدرێت بەوەی کە لە دوای کردە پزیشکییەکان چی پێوستن بۆ ئەوەی ئافرەتان هەست بە سەلامەتی و ئاسوودەیی و ئەرێنیبوون بکەن سەبارەت بە ئەو ئەزموونە (WHO, 2018). ئەندامە شانە نەرمەکانی ڕێڕەوی زاوزێ و ئەندامەکانی نزیکیان رەنگە تووشی زامداری و برینی سەخت ببن لە کاتی منداڵبووندا بە هۆی کردەی دادڕینی بندامێن (episiotomy)، دڕانی خۆبەخۆیی یانیش بە هۆی هەردووکیان (Renfrew et al. 1998; Johnson et al., 2004). لە زانستی منداڵبووندا، کێشە و ئاڵۆزییەکی بەرچاو بریتییە لە حاڵەتەکانی دڕانی بندامێنی (perineal lacerations) لە دەرەنجامی منداڵبوون لە ڕێگەی زێوە. زیاتر لە ٦٠٪ی ئافرەتان تووشی زامداری بندامێن دەبن لە دوای منداڵبوونی سروشتییان لە ڕێگەی زێوە و، هەموو ڕۆژێك نزیکەی ١٠٠٠ ئافرەت لە دوای منداڵبوونەکەی پێویستی بە دوورینەوەی بندامێن دەبێت (Fernando 2007). زامداری بندامێن و ناکامەکانی بواری گرنگن بۆ لەشساغی و تەندروستیی ئافرەت. زۆر ئافرەت لە سەرانسەری جیهاندا دووچاری پلەیەك لە برینی بندامێن و زێ دەبن لە کاتی منداڵبووندا (Steen & Diaz, 2018). دڕانی بندامێن لە دوو لەسەر سێی ئافرەتاندا ڕوو دەدات و وەهاش باس کراوە کە بوونەتە هۆی کێشە کۆمەڵایەتییەکان و کار دەکاتە سەر تەندروستیی دەروونی دایکان (Ott et al, 2015). زامداری بندامێن چەند کێشەیەکی تەندروستی کورتخایەن و درێژخایەنی وەهای بە دوادا دێت کە کاریگەریی نەرێنیی گرنگی دەبێت لەسەر تەندروستی ئافرەت و شێوازی ژیانی (Steen & Diaz, 2018). دواکەوتنی سارێژبوونەوەی بندامێن لە دوای منداڵبوون دەبێتە هۆی زیاترکردنی مەترسییەکانی خەمۆکی و دابڕانی کۆمەڵایەتی (Dunn et al, 2015). نەخۆشییەکانی پەیوەندیدار بە زامداری/برینی بندامێن یەکێکە لە کێشە گەورەکانی تەندروستی کە کاریگەریی لەسەر هەزاران ئافرەت هەیە. بۆیە، ئەو مامانانەی کە چاودێری پێشکەش دەکەن و یارمەتی ئافرەتان دەدەن لە کاتی منداڵبووندا زۆر گرنگە کە بەرنامەدار

و ڕاهێنراو بن بۆ ئەوەی باشترین چاودێریی گونجاو پێشکەش بکەن بە پشتبەستن بە بەڵگە و زانیارییە هەرە نوێ و سەردەمییەکان (Steen & Diaz, 2018).

## پێداچوونەوەیەکی مێژوویی بۆ دادڕینی بندامێن

لە ڕابردوودا، دادڕینی بندامێن یەکێك بوو لە کردە نەشتەرگەرییە هەرە باوەکانی زانستی منداڵبوون (Amorim et al., 2014; Melo et al., 2014). یەکەم جار لە ساڵانی ١٧٤٠دا لەلایەن مامانێکی سکۆتلەندی پێناسە کرا، کردەکانی دادڕینی بندامێن بە بەربڵاوی ئەنجام نەدەدران تا ناوەڕاستەکانی ١٩٠٠. ئەم کردەیە لە نێوان ساڵانی ١٧٤٢ و ١٩٨٠ بە گشتی کرا، ئەمەیش لەپێناو ویستی کەمکردنەوەی نەخۆشی و ناڕەحەتی و حاڵەتەکانی مردنی دایکەکە و کۆرپەلەکە. لە سەدەی بیستەمدا ئەم ویستە دواتر لە ڕێگەی گشتاندنی هەنگاو بە هەنگاوی منداڵبوون لە نەخۆشخانەکاندا پەرەی پێ درا. لە دەرەنجامدا، ئەم بڕگانە ئەنجامدانی دادڕینی بندامێنی پەیوەست کرد بە چارەسەرە پزیشکییەکانی دووگیانی. لە ساڵی ١٩٢٠دا، جۆزێف دی لی سەرەتا و بە ئاشکرا داکۆکی کرد لە تەبەنیکردنی کردەی دادڕینی بندامێن بە شێوەی ناوەند بۆ لاتەنیشت بۆ گشت حاڵەتەکانی منداڵبوون لە نافرەتانی نوێبەرەدا. لەپاڵ بۆچوونی قایلکەری دی لی و پێگەکەی خۆی لە کۆمەڵگای پزیشکیدا، هەندێك هۆکاری دیکەی کۆمەڵایەتیش ڕەنگە هۆکاری دیکە بن بۆ زیاترکردنی ئاستی پەسەندکردنی ئەم کردەیە. لە ماوەی ساڵانی دیکەی سەدەی بیستەمدا، دادڕینی بندامێن بووە کارێکی چاودێریکردنی پێوەری لەلایەن زۆرێك لەو پزیشکە ئەمریکییانەی چاودێریی منداڵبوون پێشکەش دەکرد. لە ساڵی ١٩٧٩دا، دادڕینی بندامێن لە ئەمریکادا بە نزیکەیی بە ڕێژەی ٦٣٪ی هەموو حاڵەتەکانی منداڵبوون ئەنجام دەدرا، بە ڕێژەیەکی زیاتریش بۆ نافرەتانی نوێبەرە (Clesse et al, 2019). لە شانشینی یەکگرتووی بەریتانیا و لە هەمان سەردەمدا، ڕێژەکانی دادڕینی بندامێن لە ١٤٪ بۆ ٩٦٪ و لە نێو نافرەتانی نوێبەرەدا لە ١٦-٧١٪ بووە. لەو سوودە کورتخایەنانەی گوایە سوودی بۆ نافرەتان هەیە لە کاتی منداڵبوون بریتی بوون لە ئاسانی دورینەوەی بە بەراورد بە دڕانی خۆبەخۆی بندامێن، باشتربوونی ئازاری دوای منداڵبوون و، هەروەها کەمبوونەوەی حاڵەتەکانی دڕانی (پلە سێ و پلە چوار). پزیشکانی منداڵبوون لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەهایان دانا کە ئەم برینە بچوکە دەبێتە هۆی

خێراترکردنی منداڵبوون، کەمکردنی زامداریی سەخت و یارمەتی چاکبوونەوەی بندامێنیش دەدات. لە ساڵانی ١٩٦٠دا، دادڕینی بندامێنی ڕۆتینی ڕێگەی خۆی بۆ بەریتانیاش کردەوە. بە گوێرەی بیچ (Beech)، بەکارهێنانی دادڕینی بندامێن لە ئەمریکا و بەریتانیا بە شێوەیەکی بەربڵاو لە ئەنجامی زیاتربوونی ڕێژەی چارەکردنی کارای حاڵەتەکانی منداڵبوون بوو. ئەم ڕێکارە بۆ حاڵەتەکانی منداڵبوون لە ڕێگەی زێوە یەکەم جار لە ساڵی ١٩٢٠دا پێشنیار کرا وەك ڕێگاچارەیەك بۆ پاراستنی بنەوەی حەوز لە دڕان و بۆ پاراستنی سەری کۆرپەڵەکە لەوەی کە تووشی زامداری و پێکان ببێت ( Lappen & Gossett, 2010; Rodrigues & Nene, 2018). لە ئەمریکادا، لە ماوەی نێوان ٢٠٠٦ بۆ ٢٠١٣، ڕێژەکە لە ١٧.٣٪ دابەزی بۆ ١١.٦٪ (Jiang et al, 2017).

ئەم هۆکارانەی خوارەوە بە کار هاتوون بۆ پەرەپێدانی ئەنجامدانی دادڕینی بندامێن:

- کەمبوونەوەی ئەو زامدارییەی بەر سەری کۆرپەڵەکە دەکەوێت.
- ئاسانیی دورینەوە و سارێژبوونەوەی باشتری برینەکە.
- پاراستنی ڕاگرە فاشیایی و ماسولکەییەکانی بناغەی حەوز.
- ڕێگریکردن لە دڕانی ماسولکەی بەیەکهێنەری کۆم.
- ڕێگریکردن لە عاسیبوونی شان (shoulder dystocia). (ICEA, 2017)

### پێناسەی دادڕینی بندامێن (episiotomy)

دادڕینی بندامێن (episiotomy) بریتییە لە کردەیەکی نەشتەرکاری کە بۆ گەورەکردنەوەی دەرچەی منداڵبوون و ئاسان دەرچوونی کۆرپەڵەکە ئەنجام دەدرێت ( Amorim et al., 2014, Jiang et al., 2017).

### پۆلێنکردنی دادڕینی بندامێن (Classification of episiotomy)

- دادڕینی بندامێن لە ناوەڕاستەوە (median episiotomy): لە دواوەی فورشێت (خاڵی بەیەکگەیشتنی خوارینی لچەکانی زێ) (fourchette) دەست پێدەکات و لەسەر هێڵی ناوەڕاستی ژێی ماسولکەی ناوەڕاستی بندامێن/ناوچەی زێ درێژ

دەبێتەوە. درێژکردنەوەی دڕینەکە پێویستە بە ئەستەم بگات بە نیوەی درێژیی ناوچەی بندامێن. ئەم جۆرەی دادڕینی بندامێن بە شێوەیەکی بەربڵاو لە ئەمریکا و کەنەدا بەکار دەهێنرێت.

- دادڕینی بندامێنی ناوەڕاستیی گۆڕدراو: بە زیادکردنی دوو بڕینی ناراستە پێچەوانە ڕێك لە سەرەوەی شوێنی پێشبینیکراوی ماسولکەی بەیەکهێنەری کۆم ئەنجام دەدرێت. بڕینە پێچەوانەکان هەر یەکە و لە لایەك لێ دەدرێت، ئەمەیش بە ستوونی لەسەر هێڵی ناوەڕاست و، کۆی درێژییەکەی دەبێتە ٢.٥ سم. بەکارهێنانی ئەم شێوازە گۆڕدراوە وەها لێکدەدرێتەوە کە تیرەی دەرچەی زێ بە ڕێژەی ٨٣٪ بکاتەوە بە بەراورد بە دادڕینی پێوەریی بندامێن لە ناوەڕاستەوە، ئەمەیش دەکرێت بە جیاکردنەوەی توێژ و ماسولکە بەیەکهێنەرەکانی بندامێن ئەنجام بدرێت. ئەمەیش یارمەتی دەدات لە بردنە دواوەوەی کۆم بە بێ ئەوەی هیچ مەترسییەکی پێکان بە هۆی کێشانییەوە دروست بکات.
- دادڕینی بندامێن بە شێوەی پیتی (J): ئەم دادڕینە بە بڕینێکی ناوەندی/ناوەڕاستی دەست پێدەکات و ئینجا بۆ لایەك لار دەکرێتەوە بۆ ئەوەی نەگات بە کۆم. لەم تەکنیکەدا، مەقەستی چەماوە بەکار دەهێنرێت کە لە هێڵی ناوەڕاستی زێ دەست پێدەکات تا ئەوەی بڕینەکە دەبێتە ٢.٥ سم لە دووری کۆمەوە. ئینجا پیتی (J) بە ناراستەکردنی بڕینەکە بەرەو ئێسکی سمت و بە دوورکەوتنەوە لە ماسولکەی بەیەکهێنەری کۆم دروست دەکرێت.
- دادڕینی ناوەڕاست بۆ لاتەنیشت (Mediolateral): ئەمەیان باوترین جۆری بەکارهێنراوی دادڕینی بندامێنە لە ئەوروپا. وەها پێناسە دەکرێت کە بڕینێکە لە هێڵی ناوەڕاستەوە و ئینجا بۆ لاتەنیشت و دواتر بۆ خوارەوە دوور لە کۆم ناراستە دەکرێت.
- دادڕینی لاتەنیشت (Lateral): ئەم جۆرەی دادڕین یەکەمجار لە ساڵی ١٨٥٠ بەکار هێنرا. بە دووری ١ یان ٢ سم لە دەرچەی زێوە و لە لاتەنیشتی هێڵی ناوەڕاست دەست پێدەکات و بەرەو خوارەوە شۆڕ دەکرێتەوە بەرەو بەرزایی

ئێسکی سمت. دادڕینی لەتەنیشت زۆر بەدەگمەن لە ئەدەبیاتی منداڵبووندا باس دەکرێت.

- دادڕینی لاتەنیشتی بناغەیی/رادیکاڵی (دادڕینی شوچارت): زۆر جار بە کردەیەکی بەدەر لە نەشتەرگەریی منداڵبوون دادەنرێت. دادڕینێکی تەواو فراوانکراوی بندامێنە کە دەچێتە قووڵایی ناوەوەی زێوە و بەرەو خوارەوە و بە دەوری ریخۆڵە راستەی کۆم لار دەکرێتەوە. دەکرێت لە سەرەتای کردەی دەرهێنانی منداڵدان یان ملی منداڵدان (hysterectomy or trachelectomy) لە رێگە زێوە ئەنجام بدرێت بۆ ئەوەی یارمەتی بدات لە دەستگەیشتن بە لاتەنیشتەکان یان بە ناوچەی پارامێتری، بۆ ئەوەی رێگە بدات بە دەرهێنانی شانەزێی (پاسەریی) پشتگوێخراو، یان هەندێك جاری کەمیش بۆ ئاسانترکردنی منداڵبوون لە حاڵەتە ئاڵۆزەکاندا (کورپەڵەی سەر گەورە، هاتنەدەرەوەی بەزەحمەت بە سمتدا یان بۆ راستکردنەوەی عاسیبوونی شانی کورپەڵە) ئەنجام دەدرێت.
- دادڕینی پێشەوەیی (Anterior episiotomy): یان لادانی کاریگەریی خەتەنەکردن (رێکارێکە بۆ کردنەوەی ئەو شوێن برینەی کە لە هەندێ لە ناستەکانی خەتەنەکردنی مێینە دروست بووە) هەمیشە لە کاتی منداڵبووندا بۆ ئەو ئافرەتانە ئەنجام دەدرێت کە پێشتر بە هۆی خەتەنەکردنەوە تووشی تێکدانی ئەندامەکان بوون. پزیشکەکە یان نەشتەرکارەکە لە پێشەوەی زێ پەنجەی دەباتە ژوورەوە بەرەو ناراستەی ناوچەی تووکەبەری. بۆ کردنەوەی شوێن برینەکە، لە ناوەڕاستەوە لچە زێ ناوینەکان/بچوکەکان (labia minora) بە یەکەوە نوسێنراون درز دەکرێت تا ئەوەی کە بۆریچکەی دەرمێکیی میزەڕۆ بەدەر دەکەوێت و لێوارەکانی پێشەوە (anterior flap) بە تەواوی دەکرێنەوە. پاشماوەکانی قیتکە نابێت ببڕدرێن. هەروەها دەکرێت جۆرێکی دیکەی دادڕین (بە پەسەندکراوی دادڕینی ناوەڕاست بۆ لاتەنیشت) پێویست بکات لە کاتی منداڵبوونەکەدا.

(kalis et al., 2012, Goh et al., 2018)




شێوەی ژمارە ١: جۆرەکانی دادڕینی بندامێن: ١- دادڕینی ناوەڕاستی بندامێن، ٢- دادڕینی گۆڕدراوی ناوەڕاستی بندامێن، ٣- دادڕینی بندامێن بە شێوەی پیتی (J)، ٤- دادڕینی بندامێن لە ناوەڕاست بۆ لاتەنیشت، ٥- دادڕینی لاتەنیشت، ٦- دادڕینی لاتەنیشتی رادیکاڵی (دادڕینی شوچارت)، ٧- دادڕینی پێشەوەیی (تیرە سپییەکە). لە ئێستادا هیچ پێوەرێکی نێودەوڵەتی لەبارەی ئەوەی داخۆ دادڕینی بندامێن بۆ لای راست یان بۆ لای چەپ بدڕێنرێت (ئەمە دادڕینی ناوەڕاستی ناگرێتەوە). ئەم وێنەیە بەراوردکردنی شوێنەکانی جۆرە جیاوازەکانی دادڕینی بندامێن نیشان دەدات. ئەوانەی لای راست شێوەی پیتی (J) و دادڕینی ناوەڕاست بۆ لاتەنیشت و دادڕینی لاتەنیشت و لای چەپیش دادڕینی لاتەنیشتی رادیکاڵی نیشان دەدات کە بێ مەبەست و بە رەمەکی خراونەتە روو. (Kalis et al., 2012)

### برینی دادڕینی بندامێن (Episiotomy Incision)

ئەم برینە (درزە) دەکرێت لەسەر هێڵی ناوەڕاست (لە ناوەندەوە یان لەسەر هێڵی ناوەڕاست بۆ خوارەوە بەرەو کوم بێت) یان لە هێڵی ناوەڕاستەوە دەست پێبکات بەرەو خوارەوە بڕات و ئینجا بۆ لاتەنیشت و دوور لە کۆم لابدرێت. مامان یان پزیشکی منداڵبوون دەتوانێت

بڕیار بدات بە بەکارهێنانی مەقەس یان تیغی نەشتەرگەری برینێکی/درزێکی نەشتەری لە بندامێن بکاتەوە بۆ ئەوەی منداڵەکە بە ئاسانی لەدایك ببێت و بۆ ڕێگریکردن لە دڕانێکی سەختی وەها کە زەحمەت بێت بۆ دورینەوە. ئەم درزە دواتر بە تەقەڵ چاك دەکرێتەوە (Lappen & Gossett, 2010; ACOG, 2016).

کۆنگرەی ئەمریکی بۆ پزیشکانی منداڵبوون و نەخۆشییەکانی ئافرەتان (ACOG) لە ئێستادا پێشنیاری ئەوە دەکات کە کردەی دادڕینی بندامێن دەبێت تەنها لە حاڵەتە تەواو سنوردارەکان ئەنجام بدرێت. بەڵام هێشتا لە زۆر شوێنی جیهاندا بە فراوانی ئەنجام دەدرێت ( Lappen and Gossett, 2010; ACOG, 2016;  Rodrigues & Nene, 2018).

دەکرێت دڕانی زێ لە کاتی منداڵبووندا ڕوو بدات، زۆربەی جار لە دەرچەی زێ و لە کاتێکدا کە سەری کۆرپەڵەکەی پێدا تێپەڕ دەبێت، بە تایبەتی ئەگەر کۆرپەڵەکە بە خێرایی دەربچێت. دادڕینی بندامێن وەك هەوڵێك ئەنجام دەدرێت لەپێناو ڕێگریکردن لە دڕانی نەرمەشانەکان کە ڕەنگە ماسولکە بەیەکهێنەرەوەکانی کۆم و ڕاستەڕیخۆڵەش بگرێتەوە (Varney et al., 2019).

**پێناسەی زامداریی بندامێن (perineal trauma)**

**زامداریی بندامێن (perineal trauma)** بریتییە لە هەر زیانێك بەر کۆئەندامی زاوزێ بکەوێت لە کاتی منداڵبووندا کە خۆبەخۆ ڕوودەدات یان بە هۆی کردەیەکی نەشتەرکاری ئەنجام دەدرێت کە پێی دەووترێت دادڕینی بندامێن (episiotomy). زامداریی بندامێنی پێشەوەیی (**Anterior perineal trauma**) برینێکە لە لچەکان، بەشی پێشەوەی زێ، میزەڕۆ یان لە قیتکەدا ڕوو دەدات و، بە زۆریش نەخۆشیی کەمی لەگەڵدا دێت. زامداریی بندامێنی پاشەوەیی (**Posterior perineal trauma**) برینێکە لە دیوارەی پاشەوەی ناو زێ، ماسولکەکانی بندامێن یان لە ماسولکەی بەیەکهێنەری کۆم. دڕانە خۆبەخۆکان بەم شێوانەی خوارەوە پێناسە دەکرێن (Varney et al., 2015; Kettle et al., 2008):

- درانی پلە یەك: برینەكان تەنها لە فورشیت (خاڵی بەیەكگەیشتنی خوارینی لچەكانی زێ) (fourchette) و پێستی رووكەشی بندامێن یان لە چڵمەشانەكانی زێ (vaginal mucosa) روو دەدەن.
- درانی پلە دوو: ئەو برینانەیە كە خاڵی بەیەكگەیشتنی خوارینی لێوەكانی زێ (fourchette) و پێستی رووكەشی بندامێن یان لە چڵمەشانەكانی زێ تێپەڕ دەكات و دەگات بە ماسولكە و فاشیاكانی (fascia) بندامێن، بەڵام ناگەن بە ماسولكەی بەیەكهێنەری كۆم (anal sphincter). دادرینی بندامێنی پلە دوو بە كۆست یان زامداریی بندامێن بە هۆی چارەسەری پزیشكییەوە دادەنرێت (Goh et al., 2018).
- درانی پلە سێ: كاتێكە كە پێستی فورشیت (fourchette) و، پێستی بندامێن و، چڵمەشانەی زێ و، ماسولكەكان و، ماسولكەی بەیەكهێنەری كۆم دەدرێن؛ درانی پلە سێ دەكرێت بۆ سێ لقەبەش دابەش بكرێن كە بریتین لە:
  - ٣آ – كاتێك كە كەمتر لە ٥٠٪ی ماسولكەی بەیەكهێنەری دەرەكیی كۆم دەدرێت/دەبڕێت.
  - ٣ب – كاتێك كە زیاتر لە ٥٠٪ی ماسولكەی بەیەكهێنەری دەرەكیی كۆم دەدرێت/دەبڕێت.
  - ٣ج – كاتێك كە ماسولكەی بەیەكهێنەری دەرەكی و ناوخۆیی كۆم دەدرێت/دەبڕێت.
- درانی پلە چوار: فورشیت و، پێستی بندامێن و، چڵمەشانەی زێ و، ماسولكەكان و، ماسولكەی بەیەكهێنەری كۆم و چڵمەشانەی راستەڕیخۆڵە دەدرێن.
- درانی كونە دوگمە (Button-hole): ئەم درانە چڵمەشانەی راستەڕیخۆڵە دەگرێتەوە لەگەڵ مانەوەی ماسولكەی بەیەكهێنەری كۆم بە سەلامەتی.

**ڕێژەی دادڕینی بندامێن (episiotomy) و دڕانی بندامێن (perineal tear)**

لە ڕابردوودا، دادڕینی بندامێن یەکێك بووە لە کردە نەشتەرگەرییە هەرە باوەکان لە زانستی منداڵبووندا (Lappen & Gossett, 2010). بەکارهێنانی ڕۆتینی چیدیکە کاری پێ ناکرێت بە هۆی دەستکەوتنی بەڵگە لەسەر ئەوەی کە بە بەکارهێنانی ناڵۆزییەکان زیاتر دەبن. لە ساڵی ١٩٩٦دا، پێشنیاری ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی (WHO) بۆ دادڕینی بندامێن بە ڕێژەیەکی ١٠٪ پارەمەتیدەر بوو لە کەمکردنەوەی بەربڵاوییەکەی (ICEA, 2017). بە پێ ئەو توێژینەوە بلاوکراوەکانی بەردەست، ڕێژەی زامداری/بڕینی سەختی بندامێن و کردەی دادڕینی بندامێن بە پێی توێژینەوە و وڵاتە جیاوازەکان دەگۆڕێت وەك ئەوەی لە خشتەی ژمارە ١.١ ڕوون کراوەتەوە.

**خشتەی ژمارە ١.١- ڕێژەی دادڕینی بندامێن و زامداریی بندامێن لە وڵاتە جیاوازەکاندا**

| وڵات | جۆری توێژینەوە | ساڵ | قەبارەی/ژمارەی نمونەکان | | ڕێژەی دادڕینی بندامێن | ڕێژەی دڕانی بندامێن |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | نۆبەرە | سکی چەند جارە | | |
| تورکیا | ڕابردوویی | 2017 | 2971 | 5616 | 93.2 | _____ |
| هیند | پانەبڕگەیی | 2011 | 64 | 56 | 86.7% | - |
| مەکسیك | تاقیکردنەوەی هەڕەمەکیی کۆنترۆڵکراو | 2013 | 38 | 40 | 12.8 | 2.6 |
| نەیجیریا | پانەبڕگەیی | 2012 | 280 | - | 34.3 | - |
| بەرازیل | پانەبڕگەیی | 2011 | 150 | 153 | 60.7 | 6.6 |
| مەغریب | پانەبڕگەیی | 2013 | 770 | 760 | 34.5 | - |
| نەیجیریا | پانەبڕگەیی | 2010 | - | 375 | 25.1 | - |
| پاکستان | پانەبڕگەیی | 2012 | 1488 | - | - | 7 |
| تورکیا | تاقیکردنەوەی هەڕەمەکیی کۆنترۆڵکراو | 2015 | 72 | 70 | 42.2 | 8.4 |
| کامیرۆن | پانەبڕگەیی | 2015 | 148 | - | 3.3 | 18.9 |
| بەنگلادیش | گرووپی | 2012 | 242 | 240 | 10.1 | 1.1 |
| ئێران | تاقیکردنەوەی هەڕەمەکیی کۆنترۆڵکراو | 2011 | 50 | - | 80 | 26 |
| یەمەن | گرووپی | 2010 | 2588 | - | 75.1 | 0.27 |
| نیکاراگوا | دەستتێوەردانی | 2014 | 380 | 386 | 31.2 | 3 |
| ئێران | تاقیکردنەوەی هەڕەمەکیی کۆنترۆڵکراو | 2012 | 23 | 22 | 84.4 | 2.2 |
| فەلەستین | پانەبڕگەیی | 2013 | 68 | 66 | 79.9 | - |
| گامبیا | گرووپی | 2013 | 190 | 191 | 27.8 | 16 |
| ئوردن | پانەبڕگەیی | 2009 | 450 | 455 | 54.3 | 15.8 |
| تانزانیا | دەستتێوەردانی داهاتوویی | 2011 | 260 | 250 | 18.4 | - |
| گینیا | گرووپی داهاتوویی | 2014 | 720 | 731 | 13.2 | 3.1 |
| مالیزیا | تاقیکردنەوەی هەڕەمەکیی کۆنترۆڵکراو | 2013 | 82 | - | - | 96.3 |
| چین | تاقیکردنەوەی هەڕەمەکیی کۆنترۆڵکراو | 2014 | 28 | | 47.1 | 7.8 |
| بەریتانیا | پانەبڕگەیی | 2015 | 128 | 120 | 14 | 14.5 |

(Bello et al., 2010, Frass and Al-Harazi, 2010, Francisco et al., 2011, Singh and Rathore, 2011, Alayande et al., 2012, Brohi et al., 2012, Ferdous et al., 2012, Geranmayeh et al., 2012, Assarag et al., 2013, Hassan et al., 2013, Sulaiman et al., 2013, Spitzer et al., 2014, Wang et al., 2014, Demirel and Golbasi, 2015, Egbe et al., 2015, Bahtışen et al., 2017; Calvo Aguilar et al., 2013;; Azam et al., 2011; Garcia-Elorrio et al., 2014; Kaplan et al., 2013; Khresheh et al., 2009; Sorensen et al. 2011).

## هۆکارە پەیوەندیدارەکان بە زامداری بندامێن ( Associated factors with perineal (trauma

هۆکارە پەیوەندیدارەکان بە زامداریی بندامێن لە توێژینەوە جیاوازەکاندا جیاوازن. لە هەندێ لێکۆڵینەوەدا، تەمەنی دایکەکە، جارەکانی منداڵبوون، دۆخی پاڵکەوتنی دایکەکە لە کاتی منداڵبووندا، هاندەری/یارمەتیدەری ژانگرتن، تەمەنی سك (دووگیانی)، کێشی کۆرپەلەکە، بە خراپی هاتنەدەرەوە و هەڵکەوتەی خراپی کۆرپەلەکە، منداڵبوون بە نامراز، عاسیبوونی شانەکان، ژانگرتنی بەپەلە، ماوەی قۆناغی دووەمی ژانگرتن، ئاستی هۆشیاری/خوێندەواریی دایکەکە، کۆرپەلەی کوڕ، منداڵبوون لە نەخۆشخانەیەکی تایبەت و، رەگەز و رەچەڵەکی هەموویان وەك هۆکاری پەیوەندیدار بە برینی بندامێنی دانراون. لەگەڵ ئەوەشدا، هەندێ توێژینەوەی دیکە ئەوەیان دەرخستووە کە کێشی کۆرپەلەکە، قەڵەوی، تەمەنی دایکەکە، ماوەی قۆناغی دووەم، چێوەی بازنەیی سەری کۆرپەلەکە و ئاستی هۆشیاری/خوێندەواری دایکەکە بە هۆکاری پەیوەندیدار بە زامداریی بندامێن دانەنراون. ئەم جیاوازییانە دەکرێت بە هۆی جیاوازییەکانی کەسانی ناو توێژینەوەکان بن. لە هەندێ توێژینەوەدا، لێکۆڵینەوە تەنها بۆ حاڵەتەکانی دادڕینی بندامێن ئەنجام دراون و لە هەندێ توێژینەوەی دیکەشدا، بۆ دڕانەکانی بندامێن لێکۆڵینەوە کراون. هەروەها لە ژمارەیەك توێژینەوەدا، لێکۆڵینەوە لە کۆستە/زامدارییە سەختەکانی پلە سێ و پلە چواری بندامێن کراوە Albers et al., 2006, Fernando, 2007, Mesdaghinia et al., 2011, da )) Silva et al., 2012, Khani et al., 2012, Dahlen et al., 2013, Smith et al., 2013, Mora-Hervás et al., 2015, Gauthaman et al., 2016, Abedzadeh-.(Kalahroudi et al., 2019; Niguse et al. 2016

## نیشاندەرەکانی دادڕینی بندامێن (Indications of episiotomy)

هەرچەندە دادڕینی بندامێن بە هۆی چەندین هۆکارەوە ئەنجام دەدرێت لەلایەن پێشکەشکارانی چاودێریی تەندروستی، بەڵام زۆرینەی ئەو کردانە پشتبەستوو نین بە بەڵگە. لەبەر ئەمەیش، رێکخراوی تەندروستی جیهانی پێشنیاری ئەوە دەکات کە "بەکارهێنانی

دادڕینی بندامێنی ڕۆتینی یان هەڵبژاردەیی پێشنیار ناکرێت بۆ ئەو ئافرەتانەی کە بە سروشتی و لە ڕێگەی زێوە منداڵیان دەبێت". بە گشتی، ئێستا دادڕینی بندامێن لەسەر بنەمای تاکەکەسی ئەنجام دەدرێت. وەها دادەنرێت کاتێك کە بارودۆخە کلینیکییەکان نەخۆشە بخەنە بەر مەترسیی بەرکەوتنی بە دڕانی پلە سێ و پلە چوار یان کاتێك کە لێدانی دڵی کۆرپەڵەکە جێی نیگەرانی بێت، ئەوا خێراترکردنی پرۆسەی منداڵبوونەوەکە لە ڕێگەی زێوە وەها بە باشتر دەزانرێت بۆ منداڵەکە (ICEA, 2017). نوێترین بەڵگە لەسەر نیشاندەرەکانی دادڕینی بندامێن لە بەشی پێنجەمی ئەم کتێبەدا بە تێروتەسەلی روون کراوەتەوە.

**کێشە و ئاڵۆزییەکانی زامداریی بندامێن (Complications of perineal trauma)**

بەشێکی زۆری توێژینەوەکانی پەیوەست بە ئەو ئاکامانەی دادڕینی بندامێن کێشە؛ کورتخایەن و مامناوەندخایەنیان هەڵسنگاندووە؛ کێشە درێژخایەنەکانی دادڕینی بندامێن روون نەکراونەتەوە.

کاریگەرییە کورتخایەنەکان:

- حاڵەتەکانی دڕانی بندامێن
- خوێنڕێژی و لەدەستدانی خوێنی زۆر
- ئاوسانی شوێنی برین
- هەوکردنی شوێنی برین
- زیانگەیشتن بە ماسولکەی بەیەکهێنەری کۆم و چلمەشانەکانی ڕاستەڕیخۆڵە
- برینداربوونی میزەڕۆ
- برینداربوونی میزڵدان
- دروستبوونی مەیینی خوێن
- ئازار
- خۆلێکنەدانی برینی دادڕینی بندامێن

کاریگەرییە درێژخایەنەکان:

- هەوکردنی درێژخایەن
- تێکچوونی ئەرکی کۆم و ڕاستەڕیخۆڵە
- ڕانەگرتنی میز
- شۆڕبوونەوەی ئەندامەکانی حەوز
- تێکچوونی توانای سێکسی
- نازار

ناکامە دەروونییەکانی زامداریی بندامێن بریتین لە خەمۆکی و کێشە دەروونییەکانی چالاکی سێکسی، دواکەوتنی هۆگربوون بە منداڵەکە و وەستاندنی پێدانی شیری مەمك ( Webb, 2020).

## بەشی دووەم

# تویێکاریی بندامێنی مێینە لە بارەی پێکانەکانی ماسولکەی بەیەکهێنەری کۆم و دڕانەکانی بندامێن بە هۆی منداڵبوونەوە

د نارسەر سەنیتوس

**پێشەکی**

بندامێن (پەرینە، بنلینگ، هەتەك، ناوچەی زێ، نێوان زێ و کوم) (Perineum) بەشێکی رووکەشییە کە دەکەوێتە نێوان ئەندامی زاوزێی دەرەکی و کوم و، جودایە لە بۆشایی حەوز. بندامێن لە چەند پێکهاتەیەکی جۆراوجۆری ماسولکە ریشاڵی (fibromuscular) و دەمار و بۆری خوێن (neurovascular) پێك دێت و، رۆڵی راگرتن بۆشایی حەوزیش دەبینێت. هەروەها پارێزگاری دەکات لە یەکانگیری پەردەی بنەوەی حەوز (pelvic diaphragm) (وەك: ماسولکەی راگری کوم (levator ani) و ماسولکەی کلێنچك (coccygei)) (Moore *et al*. 2010). هەروەها، بندامێنی مێینە (female perineum) بەشدار دەبێت لە کردارەکانی مێزکردن، پیساییکردن و زاوزێ. سنورەکانی بندامێنی مێینە هاوتایە لەگەڵ قەبارەی دەرچەی حەوز: بەیەکگەیشتنی دوو چڵە ئێسکی تووکەبەری لە پێشەوە؛ سمتەجوڵە بۆ نوکی کلێنچکە، لە پشتەوە و؛ گرێکانی سمت (ischial tuberosities) لە لاتەنیشتەوە. گرێبەندەکانی سمتەجوڵە کەنارەکانی لای پشتەوەی بندامێن دیاری دەکات. بنەوەی بندامێن بریتییە لە بنەوەی حەوز (بنەوەی سێبەند) و بناغەکەی پێك دێت لە فاشیا (fascia) و پێست (Moore *et al*. 2010).

کاتێك کە پەلەکانی خوارەوە دێنەوە یەك ناوچەی زێ شێوەی ئەڵماسی وەردەگرێت کە بە چوار هێڵ پێکەوە دەبەسترێتەوە، دووانیان یەکگرتەی دوو ئێسکی تووکەبەری ( pubic symphysis) و هەردوو چڵە ئێسکی سمت و تووکەبەری (ischiopubic rami) بە یەك دەگەیەنێت و دووانەکەی دیکە هەردوو چڵە ئێسکی تووکەبەری بە نووکی کلێنچکە دەگەیەنن (Moore et al. 2010). لە رووی توێکارییەوە، ناوچەی زێ دەکرێت بۆ دوو سێگۆشە دابەش بکرێت لە رێگەی هێڵێکی نێوانبڕی ناوەندی کە هەردوو چڵە ئێسکی سمت و تووکەبەری (ischiopubic rami) بە یەك دەگەیەنێت. بەمەش سێگۆشەی مێزەڕۆ و زاوزێ (urogenital) دەکەوێتە پێشەوە و سێگۆشەی سمت و کوم دەکەوێتە پاشەوە. دوو لەسەر سێی مێزەڕۆی دووری مێینە دەکەوێتە ناو ناوچەی زێ و بەشی دووری زێ ( distal vagina) دەکەوێتە تەختایی دەمی زێ (introitus plane) ( Hosseinzadeh et al., 2012).

## پەردەی بندامێن (Perineal membrane)

سێگۆشەی میزەڕۆ و زاوزێ هەر یەکە لە کیسەی بنداميێنی رووکەشی یان پەردەی بەردەم میزەڕۆ و زێ (urogenital diaphragm) و کیسەی بنداميێنی قووڵ لەخۆ دەگرێت. بە پێچەوانەی سێگۆشەی سمت و کۆم (ischioanal triangle)، سێگۆشەی میزەڕۆ و زێ بە پەردەی بنداميێنی داپۆشراوە کە پێك دێت لە شانەی ماسولکە فاشیایی (musculofascial) و لە لای سەرەوە تێکەڵ بووە لەگەڵ فاشیای راگری کۆم (levator ani) و بەردەوام دەبێت لەگەڵ ماسولکە بنەڕەتییەکانی میزەڕۆ و زێ. خۆبەستنەوەی بە قەدی بنداميێن ( perineal body) دەبێتە هۆی راگرتنی میز (Fahmy and Munakomi 2019).

رۆڵێکی گرنگی پەردەی بنداميێن ئەوەیە کە کیسەی قووڵ و رووکەشیی بنداميێن لە یەك جیا دەکاتەوە. ئەم کیسانە چەندین ماسولکە و پێکهاتەی جۆراوجۆری میزەڕۆ و زێ لەخۆ دەگرن. کیسەی رووکەشیی بنداميێنی سێ سنوری هەیە کە بریتین لە: سەرەوە، ژێرەوە و پێشەوە. ئەمانەیش پەیوەستن بە ماسولەکەکانی پێشەوەی سك و، پەردەی میزەڕۆ و زێ و ماسولکەی ئیسکی ئەشکەوتی سمت (ischiocavernosus) و، سەلکەی ئیسفەنجی (bulbospongiosus) و ماسولکە پانەی بنداميێن (Fahmy and Munakomi 2019).

## گەیشتنی هەستە دەمار بە ناوچەی بنداميێن (Nerve supply of the perineum)

گەیشتنی دەمارەکانی جووڵە و هەست بە ناوچەی بنداميێن (ناوچەی زێ) لە لقەکانی دەماری دامێن (pudendal nerve) سەرچاوە دەگرن کە لە ریشە دەماری (S2-S4) سەرچاوە دەگرن. هەستە دەماری دامێن هەستەوەرەکانی بەشی ژێرەوەی راستەریخۆڵە/کۆم دابین دەکات کە هەست دەدات بە بەشی دەرەوەی ماسولەکەی یەکخەری کۆم و بە پێستی دەوروبەری کونی کۆم؛ هەروەها هەست دەدات بە (ماسولکەی راگەی کۆم) لە ناوچەی بنداميێن و بە لقەکانی هەستە دەمارەکەی سەرپشتی ناوچەی بنداميێن (قیتکە). زۆر جار، زیانگەیشتن بە دەماری دامێن دەبێتە هۆی لەدەستدانی کۆنترۆڵی میزکردن یان پیساییکردن، ئەمەیش بە پێی ئەو لقە دەمارەی کە زیانی پێ گەیشتووە. هەروەها دەمارەی دیکەی

سەربەخۆ هەست دەدەن بە ماسولکە خۆکارەکانی (involuntary muscles) کۆنترۆڵکردنی میزکردن و پیساییکردن ( بۆ نمونە وەك، ماسولکەی بەیەکهێنەری ناوەوەی کۆم، ماسولکەی بەیەکهێنەری ناوەوەی میزەڕۆ).

**قەدی بندامێن (Perennial body)**

قەدی بندامێن گرنگییەکی تایبەتی بۆ بندامێنی ئافرەت و بۆ کاتی دادڕینی بندامێن هەیە. قەدی بندامێن بریتییە لە پێکهاتەیەکی ماسولکە ریشاڵییە کە سێگۆشەی میزەڕۆ و زێ و سێگۆشەی سمت و کۆم لە یەك جیا دەکاتەوە. سنورەکانی لە لای خوارەوە (لە لای کلکێنەوە) بریتییە لە پێستی بندامێن و، رووەوە پێشەوە دەدات لە پشتەوەی زێ و، رووەو پشتەوەش دەدات لە رووی پێشەوەی راستەڕیخۆڵە. سنوری لاتەنیشەکانیشی بریتین لە چڵە ئێسکی سمت و تووکەبەری (ischial rami puborectalis) و، ماسولکەی نێوان زێ و تووکەبەر (pubovaginalis) و ماسولکەی بەر و زێ و کلێنچکە (pubococcygeus). لە قووڵترین خاڵدا، قەدی بندامێنی دەکەوێتە پێشەوەی کەناڵی کۆم (Woodman and Graney 2002). بە درێژایی لای سەرەوە و پشتەوەی قەدی بندامێن پەیوەندیدارە بە ماسولکەی ناوینی بەیەکهێنەری کۆم، ریشاڵەکانی ماسولکەی بەیەکهێنەر بە درێژایی دیوارەی پشتەوەی زێ شۆڕ دەبێتەوە بۆ نزیك بەیەکگەیشتنی کۆم و راستەڕیخۆڵە (anorectal junction) ( Oh and Clark 1973).

دەکرێت قەدی بندامێن پەیوەست بکرێت داربەستێکی ماسولکە بۆ پێکەوە نوساندنی ماسولکەکانی پەردەی حەوز (راگری کۆم) (pelvic diaphragm) و ماسولکەکانی بندامێن (ماسولکەی رووکەشی بەر-زێ-کلێنچکە و ماسولکەی قووڵی بندامێن، ماسولکەی بەپانیی قووڵی بندامێن و ماسولکەکانی میزەڕۆ). زۆری پێوەنوسانی ماسولکەکان بە قەدی بندامێن دەبێتە هۆی یەك پارچەیی ناوچەی بندامێن. بەم شێوەیە، قەدی بندامێنێکی بەهێز رێگر دەبێت لە شۆڕبوونەوەی بناغەکانی حەوز و کۆئەندامی زێ و میزەڕۆ. لە روو فیسیۆلۆجییەوە، چوونەیەکی قەوسە ژێیەکانی فاشیای حەوز یارمەتی قەدی بندامێن دەدات

فشاری ناوسك كەم بكاتەوە و، بەم شێوەیەش كونی/چاڵی زێ و میزەڕۆ بپارێزێت (Woodman and Graney 2002).

هەر بە ئەم تازەییە كە قەدی بندامێن وەها دانرا كە رۆڵێكی یەكانگیر دەگێڕێت لە پاراستنی توانای راگرتنی پیسایی بەوەی كە وەك جیاكەرەوەیەكی سروشتی كار دەكات لە نێوان زێ و راستەڕیخۆڵە (Hakelius 1979; Woodman and Graney 2002). بەم شێوەیە، پاراستنی توانای راگرتنی راستەڕیخۆڵە لەلایەن هەندێ نوسەرەوە وەك كارێكی سەرەكیی قەدی بندامێن دادەنرێت بە هۆی ئەوەی كە چەندین ماسولكەی جۆراوجۆری پێوە پەیوەستە.

## سێگۆشەی سمت و كۆم (Ischioanal triangle)

سێگۆشەی سمت و كۆم ئەندامی كۆم لەخۆ دەگرێت كە بریتییە لە شوێنی پیساییكردن و لەلایەن ماسولكەكانی راگری كۆم و ماسولكەی بەیەكهێنەری ناوخۆیی و دەرەكیی كۆم دەپارێزرێت. ئەم پێكهاتانە راگرتنی پیسایی كۆنترۆڵ دەكەن. ماسولكەی راگری كۆم لە حاڵەتەكانی راگرتنی پیسایی و لە كاتی منداڵبووندا بەكار دەهێنرێت. ماسولكەی بەیەكهێنەری ناوەوە و دەرەوەی كۆم دەكەونە كۆتایی كەناڵی كۆم. ماسولكەی بەیەكهێنەری ناوەوەی كۆم بە هۆی سیستمێكی سەربەخۆوە (ماسولكەی خۆكار) دەبزوێنرێت. لە بەرانبەردا، ماسولكەی بەیەكهێنەری دەرەوەی كۆم (ماسولكەی خۆكار) و ماسولكەی راگری كۆم لە لایەن دەماری دامێنەوە هەستیان پێ دەدرێت (Jacob, 2008).

## تێڕوانینێكی گشتی بۆ پێكهاتەكانی زێ (Overview of the structures of the vulva)

كۆئەندامی زاوزێی دەرەكیی مێینە كە لە دەرچەی زێ (vulva) و پۆبكەی تووكەبەری و لچە گەورەكان و لچە بچوكەكان و قیتكە و زێ/كێلان (vagina) و بەشی دەرەكیی میزەڕۆ و رژێنەرەكانی كونی زێ (رژێنەری بارتۆلین). زێ بە چەندین جۆر چینی فاشیای بندامێنی و ماسولكەی رووكەشی و قووڵی بندامێنی رادەگیرێت (Drake et al. 2005; Muhleman et al. 2017).

ڕێڕەوی زێ (vestibule) هەر یەکە لە میزەڕۆ و، دەمی زێ و، پۆپیتەی پەردەی کچێنی و ڕژێنەرەکانی ڕێڕەوی زێی تێدایە. ڕێڕەوی زێ بە ماسولکەی سەلکەی ئیسفەنجی (bulbospongiosus) دەورە دراوە کە لە پێشەوە دەنوسێت بە خاڵی یەکگرتنی چلە ئێسکی سمت و تووکەبەری و لە پاشیشەوە دەگات بە قەدی بندامێنی (Muhleman et al. 2017).

ناوزێ (کێلان) (vagina) بریتییە لە بۆشاییەکی شێوە بۆری/سیلندەری دروستبوو لە ماسولکەی ریشاڵی، کە لە توێژاڵی چینچینی (پولەکەیی) ناکریاتینە پێك دێت و توانایەکی بەرچاوی کێشهاتن (لاستیکی) هەیە و بە چینێکی شێوە چرچ و لۆچ لە سەرەتای ناوزێوە تا ملی منداڵدان داپۆشراوە (Chiva and Magrina 2019; Muhleman et al. 2017). کونی/بۆشایی ناوزێ بە نزیکەیی ٦.٣سم درێژە و لە منداڵدانەوە درێژ دەبێتەوە بۆ پێشەکیی/دەرچەی زێ، ئەمە لە کاتێکدا کە ئافرەتەکە لە ڕووی سێکسییەوە نەورووژابێت (Barnhart et al., 2006; Matthes and Zucca-Matthes,2016).




شێوەی ژمارە ١- پێکهاتە سەرەکییەکانی زێ. وەرگیراوە لە ( Ron AF Greve
(http://moonlit.xs4all.nl [Public domain]

## دڕانی بندامێن بە هۆی منداڵبوون لە ڕێگەی زێوە

منداڵبوون لە ڕێگەی زێوە هۆکارێکی پڕ مەترسییە بۆ تووشبوون و بەردەوامبوونی برینی ماسولکەکانی ڕاگرتنی کۆم لە کاتی منداڵبووندا (OASIS). منداڵبوون لە ڕێگەی زێوە زۆر

جار دەبێتە هۆی گۆڕانی ناستەکانی (OASIS) بە نزیکەیی لە ٥٠٪ی ئافرەتان و دواتریش بە تووشبوونیان بە ڕانەگرتنی ڕاستەڕیخۆڵە/کۆم بە ڕێژەی ٤٪ بۆ ٦٪ ( Guise et al. 2007)، بە زۆریش بە هۆی ئەو زیانەی شوێن برینی دوای منداڵبوونە کە دەبێتە هۆی شێواندنی ماسولکەی بەیەکهێنەری کۆم ( Sultan et al. 1994; de Leeuw et al. 2002; de Leeuw et al. 2008). ئەمەیش ڕاستییەکە کە زۆر جار ناکرێت لێی بەدوور بێت. بەکارهێنانی ئامراز لە کاتی منداڵبووندا ڕۆڵێکی گرنگی هەیە ( de Leeuw et al. 2008).

هەندێ کێشەی دیکە بە تایبەتی لە کاتی درێژەکێشانی منداڵبوون لە ڕێگەی زێوە هەن وەك زیانگەیشتن بە دەماری دامێن/ئەندامەکانی زاوزێ (pudendal nerve) ( Fitzpatrick and O'Herlihy 2005; Dirro, Sastre and Sielezneff 2007). تەنانەت بە چاککردنەوەی گشتیش شانسی کارکردنی ماسولکەی بەیەکهێنەری دەرەکیی کۆم لە ئافرەتان و لە منداڵبووندا بۆ ئەوەی وەك پێش منداڵبوونی لێ بێتەوە بریتییە لە ٤٠٪ ( Fernando et al. 2006).

هەروەها بە نزیکەیی ٦،٧٨٪ لە ئافرەتان لە کاتی منداڵبوونی لە ڕێگەی زێوە تووشی کێشەی ڕانەگرتنی میز دەبن. هەروەها ئەمە لەو ئافرەتانەیشی کە منداڵیان نابێت زۆر باوە. ئەوەش ئاشکرایە کە منداڵبوون لە ڕێگەی زێوە مەترسیی ڕانەگرتنی میز لە دوای منداڵبوون زیاتر دەکات ( Persson et al., 2000, Jovanovic et al., 2011, Signorello et al., 2000). سینۆرێلۆ و کەسانی دیکەش (2000) جەختیان کردووەتەوە لەوەی ئەو ئافرەتانەی کە نەشتەرگەریی/کرداری دادڕینی بندامێنیان بۆ ئەنجام دراوە مەترسییەکی سێ قاتیان لەسەرە بۆ تووشبوونیان بە ڕانەگرتنی ڕاستەڕیخۆڵە لە ٣-٦ مانگی دوای منداڵبوون. هەروەها باس لەوەش کراوە کە پزیشکانی بێنەزموون ڕەنگە بەشدار بن لە کێشە چارسەرییەکانی وەك شێوانی ماسولکەی بەیەکهێنەری دەرەکیی کۆم. بە داخەوە، کەمیی چاودێریی سەرەتایی هۆکارێکی مەترسییە بۆ شێوان و تێکچوونی ماسولکەی بەیەکهێنەری دەرەکیی کۆم بە شێوەیەکی ئاشکرا (Pronk et al. 2010).

باس لەوە دەکرێت کە منداڵبوونی لەدوای یەك لە ڕێگەی زێوە دڕانی بندامێن بە پلەی سێیەم و چوارەم بە ڕێژەی ٥-٧٪ زیاتر دەکات ( O'Connell and O'Herlihy 2003, Thakar and Sultan 2009, Scheer *et al.,* 2009).

## دادڕینی بندامێن (Episiotomy) و برینداربوونی ماسولکەی بەیەکهێنەری کۆم (OASIS)

سەبارەت بە جووتبوونی نازاربەخش (dyspareunia) بەڵگەی وەها هەیە کە دادڕینی بندامێن دەتوانێت کاریگەریی خراپی هەبێت لەسەر توانای ئافرەت بۆ ئەنجامدانی چالاکی سێکسی بۆ ماوەیەکی زۆر لە دوای منداڵبوون. لێکۆڵینەوەیەك ئاماژە دەدات بە ڕوودانی ٧.٩٪ تووشبوون بە حاڵەتەکانی جووتبوونی نازاربەخش لە دوای منداڵبوون بە دادڕینی بندامێن، ئەمەیش لە بەرانبەر بە ٣.٤٪ لە ئەو ئافرەتانەی کە ئەم کردارەیان ئەنجام نەداوە (Ejegård et al., 2008).

توێژینەوەیەك باس لەوە دەکات دڕانی پلەی دوو لە ٥١.٣٪ی ئەو ئافرەتانەدا ڕوویان داوە کە لە کاتی دووەم منداڵبوونیاندا کرداری دادڕینی بندامێنیان بۆ ئەنجام دراوە بە بەراورد بە ٢٦.٧٪ی ئافرەتان کە لە یەکەم منداڵبوونیاندا دادڕینی بنداميٚنيان بۆ ئەنجام نەدراوە (Jovanovic et al. 2011).

دادڕینی بنداميٚن بۆ خۆی هۆکارێکی سەربەخۆیە بۆ زیاترکردنی مەترسیی ڕانەگرتنی میز. هەروەها، لە بەراوردکارییەکدا لە نێوان گرووپێك لە ئافرەتان کە دادڕینی بنداميٚنيان بۆ ئەنجام دراوە لەگەڵ گرووپێکی دیکە کە بۆیان ئەنجام نەدراوە لە کاتی منداڵبوونیان لە ڕێگەی زێوە ئەوەی نیشان داوە کە ڕوودانی دادڕینی بنداميٚن بە ڕێژەیەکی زیاتر لە گرووپی یەکەمدا بووە (Živković et al. 2016; Chang et al. 2010).

دەبێت تێبینی ئەوە بکرێت کە دووگیانبوون دەکرێت بۆ خۆی هۆکارێکی سەربەخۆی پێچەوانەیی بێت لە تووشبوون بە ڕانەگرتنی میز لە دوای منداڵبووندا ( Živković et al. 2016). بەم شێوەیە، بەکارهێنانی دادڕینی بنداميٚن ڕەنگە وا لە هەندێ ئافرەت بکات خێراتر تووشی برینداری ماسولکەی بەیەکهێنەری کۆم (OASIS) ببێت. هەندێ هۆکاری دیکەی

تووشبوون بە (OASIS) بریتییە لە ئەنجامدانی دادڕینی بندامێن لە یەکەم منداڵبوون لە ڕێگەی زێوە.




شێوەی ژمارە ٢ – شوێنە گونجاوەکان بۆ ئەنجامدانی دادڕینی بندامێن لە کاتی منداڵبووندا.
وەرگیراوە لە: (Ron AF Greve http://moonlit.xs4all.nl [Public domain])

**دەرەنجام**

منداڵبوون لە ڕێگەی زێوە کێشەی گەورەی تەندروستی بۆ زۆر نافرەت دروست دەکات. بە ڕەچاوکردنی مەترسیی زۆری برینداربوونی ماسولکەی بەیەکهێنەری کۆم (OASIS) بە هۆی منداڵبوون لە ڕێگەی زێوە یان بە هۆی دادڕینی بندامێن، پێویست بە تێگەیشتنێکی ڕوون دەکات لە توێکاری بندامێن. لەم کاتەی ئێستادا، ناکرێت دادڕینی بندامێن لە کردارە نەشتەرگەرییەکان دەربکرێت و وەلا بنرێت. ناڵۆزیی بندامێنی نافرەت پێویست بە ووریایی نەشتەرگەری دەکات. هەروەها، پێویستە تێبینی ئەوە بکرێت کە پێکهاتە توێکارییەکانی مێینە دەکرێت بە هۆی کێشە جۆربەجۆرە کلینیکییەکانەوە تووشی پێکان و ناڵۆزیی ببن، وەك خوێنڕێژی دوای منداڵبوون و، نازاری کاتی جووتبوون و، برین و ناسۆر لە میزەڵدان و ڕاستەڕیخۆڵەدا، ڕانەگرتنی میز و، شوێن برینی دوای نەشتەرگەری.

## بەشی سێیەم

# پێداچوونەوەی زانیارییە بڵاوکراوەکان لە سەر زامداریی بندامێن و دادڕینی بندامێن  لە کوردستاندا

د. حمدیه میرخان احمد

چەندین توێژینەوە لە هەرێمی کوردستان لەبارەی دادڕینی بندامێن و، زامداریی بندامێن و چالاکییەکانی مامانەکان ئەنجام دراون. دەرەنجام و ئاکامەکانی لە خوارەوەدا پوخت کراونەتەوە.

**چالاکیی مامانەکان سەبارەت بە دادڕینی بندامێن و زامداریی بندامێن**

توێژینەوەیەکی بەرفراوانی پانەبڕگەیی (cross-sectional) لە سێ نەخۆشخانەی حکوومی سێ پارێزگاکەی هەرێمی کوردستانی عێراق، هەولێر و دهۆك و سلێمانی ئەنجام درا. شوێنەکانی بریتی بوون لە گەورەترین نەخۆشخانە فێرکارییەکانی لەدایکبوون لە ئەم سێ پارێزگایەدا؛ ئەم سێ نەخۆشخانەیە بە شێوەیەکی گشتگیر چاودێریی دایکایەتی پێشکەش بە گشت هەرێمەکە دەکەن. کەسانی ناو توێژینەوەکە هەموو ئەو مامانانەی گرتەوە کە لە هۆڵەکانی منداڵبوونی ئەو نەخۆشخانانە کار دەکەن. مەبەستەکانی ئەم توێژینەوەیە بریتی بوون لە: ۱) دیاریکردنی هۆکاری مامانەکانی نەخۆشخانە بۆ ئەنجامدانی کرداری دادڕینی بندامێن، ۲) دەستنیشانکردنی پەیوەندیی نێوان تایبەتمەندییە دیمۆگرافییەکانی مامانەکان و هۆکارەکانیان بۆ ئەنجامدانی دادڕینی بندامێن، ۳) بەراوردکردنی هۆکارە کلینیکییەکانی مامانەکان بۆ ئەنجامدانی دادڕینی بندامێن لە نێوان ئەو سێ شارە سەرەکییەدا، ٤) دەستنیشانکردنی هەندێ لایەنی کرداری دادڕینی بندامێن لەلایەن مامانەکانەوە، ٥) دەستنیشانکردنی تێڕوانینی مامانەکان سەبارەت بە ڕێژەی کرداری دادڕینی بندامێن، ٦) ئاشکراکردنی بۆچوونی مامانەکان لەسەر ئاستی پەسەندکردنیان بۆ تەقەڵدانی بڕینی دادڕینی بندامێن، ۷) هەڵسەنگاندنی ئەو ڕێنماییانەی چاودێریکردن لە پاش دادڕینی بندامێن لەلایەن مامانەکان بۆ ئەو نافرەتانەی دادڕینی بندامێنیان ئەنجام داوە، ۸) بەراوردکردنی ڕێنمایی مامانەکان بۆ دوای کرداری دادڕینی بندامێن لە هەر سێ شارە گەورەکەدا، ۹) دڵنیابوونەوە لەو ڕێبازانەی لەلایەن مامانەکانەوە بەکار دەهێنرێن بۆ بەدووربوون لە ئەنجامدانی دادڕینی بندامێن و، ۹) هەڵسەنگاندنی ئاستی زانینیان سەبارەت بە ئاڵۆزیی کردەی دادڕینی بندامێن لە سێ شارە سەرەکییەکەی هەرێمی کوردستان.

زۆربەی مامانەکانی کوردستان ئاماژەیان بەوە دا کە ئەنجامدانی هەر دادڕینێکی بندامێن بە پێی بڕیاری خۆیان دەبێت. لە بەرانبەریشدا، ئەوانی دیکە رایانگەیاند کە پزیشکانی منداڵبوونی پەیوەندیدار یارمەتییان دەدەن لە بڕیاردان لەبارەی ئەنجامدانی دادڕینی بندامێن. مامانەکان باسیان لە ١٦ هۆکاری کلینیکی کرد بۆ ئەنجامدانی کردەی دادڕینی بندامێن، کە بریتین لە: هۆکاری تایبەت بە دایکایەتی: رێژەکانی باشتربوونی سارێژبوون، پێشبینیکردنی دڕان یان برینداربوونی دیکە لە بندامێن، ئەشتەرگریی سێبەند (حەوز) لە پێشوودا، ترسی (هیستریای) ئافرەتەکە کە کۆنترۆڵ ناکرێت، ئەستوری یان نالاستیکیبوونی (جیڕبوونی) بندامێن؛ هۆکاری تایبەت بە کۆرپەڵە: دۆخی نالەباری کۆرپەڵەکە، کەمبوونەوەی پەستان لەسەر سەری کۆرپەڵەکە، عاسیبوونی شان، کورتکردنی کات بۆ قۆناغی دووەمی کردارەکە، هەڵکەوتەی خراپی کۆرپەڵەکە، منداڵبوونی بەئامراز، منداڵبوونی بریچ، کۆرپەڵەی گەورە؛ هۆکاری دیکە: ئەنجامدانی دادڕینی بندامێن وەك رۆتینێك بۆ ئەو ئافرەتانەی یەکەم سکیانە، ئاسانترە بۆ چاکبوونەوە و سارێژبوون بە بەراورد لە گەڵ زامداری بندامحن بۆ پزیشکان، یان فەرمانی پزیشك. بەرزترین رێژەی هۆکاری پزیشکیی باسکراو بریتیبوون لە ماکرۆسۆمیا (کۆرپەڵەی گەورە) بە رێژەی (٧١.٧٪)، منداڵبوونی بریچ (٥٨.٥٪)، عاسیبوونی شان (٥٤.٧٪)، بۆ رێگریکردن لە دڕانی بندامێن (٥٠.٩٪) و، دۆخی نالەباری کۆرپەڵە (٥٠.٩٪). پەیوەندییەکی زۆر گرنگ هەبووە لە نێوان ژمارەی ساڵەکانی ئەزموونی مامانەکان لە هۆڵەکانی منداڵبووندا و هەڵبژاردنی عاسیبوونی شان وەك هۆکارێکی کلینیکی بۆ ئەنجامدانی کردەی دادڕینی بندامێن. هەروەها پەیوەندییەکی زۆر گرنگ هەبووە لە نێوان ئاستی خوێندەواریی مامانەکان و هەڵبژاردنی رێگری لە دڕانی بندامێن و عاسیبوونی شان وەك هۆکاری کلینیکی بۆ ئەو کردەیە. هەروەها پەیوەندییەکی گرنگ هەبووە لە نێوان ئاستی خوێندەواری و هەڵبژاردنی منداڵبوونی بریچ و کۆرپەڵەی گەورە وەك هۆکاری ئەنجامدانی دادڕینی بندامێن. توێژینەوەکە بەو ئەنجامە گەیشت کە هۆکارە کلینیەکانی مامانەکان بۆ ئەنجامدانی کردەی دادڕینی بندامێن پشتبەستوو نین بە بەڵگە و یەکدەست نین لە هەر سێ پارێزگاکەی هەرێمی کوردستانی عێراق. تەمەنی مامانەکان و ساڵەکانی ئەزموونیان لە هۆڵەکانی منداڵبوون و، پسپۆری و ئاستی خوێندەواریان کاری کردووەتە سەر هۆکار و بیانووەکانیان بۆ ئەنجامدانی دادڕینی بندامێن. خولەکانی راهێنان

و بەردەوامیدان بە خوێندن بۆ مامانەکان سەرەڕای پەرەپێدانی سیاسەت و ڕێنماییە پزیشکییەکان لە هەرێمەکەدا پێکەوە پرسێکی گرنگن بۆ یەکخستنی کردەی نەشتەرگەری پشتبەستوو بە بەڵگە.

پێشنیاری توێژینەوەی زیاتر کراوە بە مەبەستی شیکردنەوەی ئەو هۆکارانەی دەبنە هۆی ئەنجامدانی دادڕینی بندامێن لە ئاستی هەر حاڵەتێکی منداڵبووندا (احمد، ۲۰۱٤). زۆرینەی مامانەکانی کوردستان وەهایان داناوە کە ڕێژەی کردەی دادڕینی بندامێن لە نەخۆشخانەکانیاندا بەرزە. وەڵامی مامانەکان سەبارەت بە هۆکارەکانی بەرزی ڕێژەی کردەی دادڕینی بندامێن پەیوەست بوون بە پێنج هۆکار: دایکایەتی (٧٧.٣٥٪)، کۆرپەڵە (٣٩.٦٢٪)، مامانەکان (٣٧.٧٣٪)، پزیشکانی ئافرەتان (٣٠.١٨٪) و، سیاسەتی نەخۆشخانە و سیستمی تەندروستی (٢٠.٧٥٪). بۆچوونی مامانەکان سەبارەت بە ئەوەی چۆن ڕێژەی کردەکانی دادڕینی بندامێن کەم بکرێنەوە بریتی بوون لە باشترکردنی چاودێریی مامانی لە کاتی مامانیدا (٧٧.٣٥٪)، چاکسازی لە سیستمی تەندروستیدا (٦٠.٣٧٪)، چاکسازی لە سیاسەتەکانی نەخۆشخانە (٥٠.٩٤٪) و، باشترکردنی چاودێریی دایکایەتی لەکاتی دووگیانیدا (٢٦.٤١٪). بە نزیکەیی گشت مامانەکان هەوڵیان داوە خۆ بەدوور بگرن لە دادڕینی بندامێن. زۆرینەیەك لە مامانەکان ڕەتیان کردووەتەوە داوای ئافرەتەکان پەسەند بکەن بۆ ئەنجامنەدانی کردەی دادڕینی بندامێن. هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆ نەبووە لە نێوان مامانەکانی هەر سێ شارەکە. گەورەترین بەشی (٥٤.٥٤٪) وەڵامی مامانەکان سەبارەت بە هۆکاری ڕەتکردنەوەی داواکاریی ئافرەتان بۆ ئەنجامدانی دادڕینی بندامێن لە خوارەوە روون کراوەتەوە: "دایکان لە ئاڵۆزییەکان تێناگەن و نیمە دەزانین کە پێویستیان پێیەتی". لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا "ئایا دەتەوێت بەرپرسیارێتی تەقەڵدانی دادڕینی بندامێن قەبوڵ بکەیت ئەگەر سیاسەتی نەخۆشخانە ڕێگەت پێ بدات؟"، زۆرینەی مامانەکان (٦٤.٢٪) بە "بەڵێ" وەڵامیان داوەتەوە و زۆرترین هۆکاریش بۆ ئەو وەڵامە ئەرێنییە بریتی بووە لە: "ئەمە بڕیاری مامانەکەیە (بڕینی جێ دەستی خۆمە) و مامانیش شارەزایی زیاتری هەیە لە پزیشکانی ئافرەتان." تەنها نۆ لە مامانەکان ڕاهێنانیان بینیوە لەسەر ئەنجامدانی کردەی دادڕینی بندامێن. لەگەڵ ئەوەشدا، باسی ئەوەیان کرد کە "بە شێوەیەکی ڕوون هیچ سیاسەتێکی نەخۆشانە یان هیچ ڕێنماییەکی تایبەت نییە سەبارەت بە سنورداریی کردەی

دادڕینی بندامێن". ئەم توێژینەوەیە بەو ئەنجام گەیشت کە لەبەرچاوگرتنی تێڕوانین و بۆچوونی مامانەکان لەسەر کردەی دادڕینی بندامێن و دابینکردنی خولی ڕاهێنان و ڕێنماییەکان بۆ ئەنجامدانی ئەم کردەیە و هەروەها ئاڵوگۆڕکردنی ئەزموونەکانیان لە نێوان خۆیاندا لە ڕێگەی گفتوگۆی گرووپی ڕەنگە یارمەتیدەر بێت بۆ کەمکردنەوەی ڕێژەی کردەی دادڕینی بندامێن و بۆ ئەوەی بە دروستی ئەنجام بدرێن لە نەخۆشخانەکانی لەدایکبوون لە هەرێمی کوردستاندا. توێژەر ڕادەسپێریت بۆئەنجامدانی توێژینەوەی زیاتر بۆ دڵنیابوون لە کوالیتیی کردەکانی دادڕینی بندامێن و ئاڵۆزییەکانی (پیرۆ، ٢٠١٦).
بەرزترین ڕێژەی لەسەدیی مامانەکان لە دهۆك و سلێمانی (١٠٠٪ و ٩٤.٤٪ بە ریز بۆ هەر یەکێکیان) ئەوەیان بە دایکەکان ڕاگەیاندووە کە دادڕینی بندامێنیان بۆ ئەنجام دەدرێت. لەگەڵ ئەوەشدا، مامانەکانی هەولێر ئەم ڕۆڵەی پێڕاگەیاندنیان نەبووە. جیاوازییەکی گرنگ هەبووە لە نێوان بەجێگەیاندنی مامانەکانی ئەو سێ شارە سەبارەت بە ئاگادارکردنەوەی دایکەکان و پێدانی ڕێنماییەکانی تایبەت بە چاودێریی دوای کردەی دادڕینی بندامێن. هۆکاری پێنەدانی ڕێنماییەکانی چاودێریی دوای کردەی دادڕینی بندامێن بۆ مامانەکانی هەولێر بە هۆی نەبوونی سیاسەتی نەخۆشخانە بووە. ئەم مامانانە باسی ئەوەیان کرد کە پزیشکەکان دوورینەوەیان ئەنجام داوە بۆ کردەکانی دادڕینی بندامێن و بەرپرسیارێتی ئەوان بووە تەقەڵیان بدەنەوە. زۆربەی مامانەکان لە دهۆك و سلێمانی ڕێنمایی دروستیان پێشکەش بە ئەو دایکانە نەکردووە کە کردەی دادڕینی بندامێنیان بۆ ئەنجام دراوە. هەروەها، جیاوازییەکی بەرچاو هەبووە لە نێوان ڕێنماییەکانی پەیوەست بە دەست شۆردن بە تەواوەتی لە پێش و لە پاش چوونە سەرئاو یان لە پێش و دوای گۆڕینی سانتی، هەروەها لەسەر قاعیدەی ئاودەستی گەرماو و، بەکارهێنانی کوشین لەکاتی دانیشتندا بۆ نەهێشتنی ئازار، بە هێواشی شۆردنی تەقەڵەکان بە ئاو و سابون لەکاتی سەرئاو و خۆشۆردندا، پاڵکەوتن بە لایەکدا لەکاتی پشوودان یان خەوتندا و، هەروەها بەکارهێنانی ئەو مەرهەم و دەرمانانەی کە پزیشک بۆی نوسیون. ئەم توێژینەوەیە بەو دەرەنجامە گەیشت کە مامانەکان لە کوردستان بە دروستی ڕێنماییان نەداوە بە ئەو دایکانەی کە کردەی دادڕینی بندامێنیان بۆ ئەنجام دراوە سەبارەت بە چاودێریکردنی خۆیان لە ماوەی پاش منداڵبوون. کاری مامانەکان جیاواز بوون لە هەر سێ شارە سەرەکییەکەی هەرێمی کوردستان. پێویست بە توێژینەوەی زیاتر دەکات

بۆ دەستنیشانکردنی بەربەستەکانی بەردەم ناتەواویی ڕێنماییەکانی چاودێری لە پاش کردەی دادڕینی بندامێن و هەروەها تایبەت بە کاریگەریی پرۆگرامی خوێندن لە نێو مامانەکان. پێویستە دووبارە پێداچوونەوە بۆ سیاسەتی نەخۆشخانەکان و پێناسەی کاری مامانەکانی بکرێن (احمد، ٢٠١٤).

توێژینەوەیەکی چاودێرییانە ئەنجام درا بە مەبەستی چاودێریکردنی چالاکییەکانی ١٥ مامان لە کاتی چوار قۆناغەکەدا، ئەمەیش بە مەبەستی دیاریکردنی کوالێتیی چالاکییەکانی پەرستار و مامانەکان لە قاوشی منداڵبووندا سەبارەت بە ئەو چاودێرییانەی لە قۆناغە چالاکەکانی یەکەم و دووەم و، سێیەم و، سەرەتای قۆناغی چوارەمی ژانگرتن ئەنجامی دەدەن لە نەخۆشخانەی فێرکاریی منداڵبوون لە شاری هەولێر. دەرەنجامەکانی پەیوەست بە دادڕینی بندامین ئەوەیان نیشان دا کە زۆربەی پەرستارەکان/مامانەکان تەکنیکەکانی پاکژکردن یان تەعقیمکردنیان بەکار نەدەهێنا (نوری و ئەحمەد، ٢٠١٨).

مامانەکانی هەر سێ نەخۆشخانەکە باسیان لە کێشەکانی دوای کردەی دادڕینی بندامێن کردووە: گەیشتنی هەڵدڕینەکە بە ماسولکەی ڕاستەڕیخۆڵە (مستقیم) یان بە خودی ڕاستەڕیخۆڵە، خوێنبەربوون، هەوکردن و/یان ئاوسانی ناوچەی دادڕینەکە، خەوشداربوونی شوێنی بەیەك گەیشتنی برینەکە، ئازاری ناوچەیی. جیاوازییەکی بەرچاو هەبووە لە ئاستی زانینی مامانەکانی لە هەر سێ شارەکە سەبارەت بە کێشە و گرفتەکانی کردەی دادڕینی بندامێن. ئەو ڕێبازانەی لەلایەن مامانەکانەوە بەکار هێنراون بۆ ڕێگیریکردن لە دادڕینی بندامێن بریتی بوون لە: دۆخی دروست پاڵخستن و، بە باشی یارمەتیدانی دۆخی زێ لە کاتی منداڵبووندا و، بەکارهێنانی ڕۆنی گەرچك و، ئەنجامدانی کردەی دادڕینی بندامێن تەنها لەو حاڵەتانەی دەستنیشان دەکرێن، ڕێنماییدان بە دایکەکە بۆ ئەوەی بە بێ پەستاندن پاڵ نەدات و، تەرخانکردنی کاتی پێویست بۆ منداڵبوونەکە و، بەکارهێنانی جێڵی چەورکردن.

بە ئەندازەی پێویست جیاوازی هەبووە لە نیوان هەر سێ شارەکە لەبارەی ڕێبازەکانی ڕێگریکردن لە دادڕینی بندامێن. مامانەکانی کوردستان باسی تەکنیکە یارمەتیدەرەکانیان نەکرد وەك، تەکنیکی ڕیتجین، مەساجی بندامێن، پەستاندنی گەرم و 'بەکارهێنانی دەست' (hands on) یان 'دەستی ئامادە' (hands poised) وەك ڕێبازی ڕێگریکردن لە دادڕینی بندامێن. ئەم توێژینەوەیە پێشنیاری باشترکردنی ئاستی زانینی مامانەکان دەکات، سەبارەت

بە کێشە و گرفتەکانی کردەی دادڕینی بندامێن و ڕێگریکردنی لەو ڕێبازانەی کە دەبنە هۆی کەمکردنەوەی ڕێژەی کردەی دادڕینی بندامێن لە نەخۆشخانەکانی لەدایکبوون. خولەکانی ڕاهێنان، پەرەپێدانی ڕێنماییەکان و دانانی سیاسەتی ڕوون و یەکدەست سەبارەت بە بەکارهێنانی کردەی دادڕینی بندامێن پێویستن بۆ ئەوەی ڕێژەی ئەم کردەیە کەم بکرێتەوە (احمد، ٢٠١٥).

**بەربڵاوی هۆکارەکانی مەترسیی دادڕینی بندامێن و دڕانی بندامێن**

توێژینەوەیەکی فراوانی پانەبڕگەیی ڕابردوویی (Retrospective cross-sectional) ئەنجامدراوە لە نەخۆشخانەی فێرکاریی منداڵبوون لە شاری هەولێر ئەوەی خستە ڕوو کە لە کۆی ١٥٠٠ نافرەت، زیاتر لە دوو لەسەر سێی نافرەتەکان (١١٠٩) کردەی دادڕینی بندامێنیان بۆ ئەنجام دراوە لەکاتی منداڵبووندا. ڕێژەی ئەو نافرەتانەی تووشی دڕانەکانی زێ و دادڕینی بندامێن بوونە بریتیی بووە لە ٢٦.١٪. پەیوەندییەکی گرنگ هەبووە لە نێوان تەمەن و دۆخی بندامێن (perineum). ئەو نافرەتانەی تەمەنیان لە بیست ساڵ زیاترە و دادڕینی بندامێنیان بۆ ئەنجام دراوە (٥٧.٢٪) تووشی دڕانی زێ نەبوون. نزیکەی یەك لەسەر سێی ئەو نافرەتانەی هەمان تەمەنیان هەیە (٢٩.٤٪) تووشی دڕانی زێ بوون سەرەڕای کردەی دادڕینی بندامێن. ئەم ڕێژەیە زۆر زیاتر بوو بە بەراورد بە ئەو نافرەتانەی تەمەنیان لە نێوان ٤٠ تا ٤٩ ساڵە، کە تووشی کردەی دادڕینی بندامێن و دڕانی زێ بوون ($p< 0.001$). ڕێژەیەکی بەرچاوی نافرەتانی نۆبەرە (٢٨.٩٪) کە دادڕینی بندامێنیان بۆ ئەنجام دراوە، لە هەمان کاتدا تووشی دڕانی زێش بوونەتەوە. ئەم ڕێژەیە بریتی بووە لە ١٧.٨٪ لە نێو ئەو نافرەتە گەورانەی چەند سکێکیان بووە ($p < 0.001$). ڕێژەی ئەو نافرەتانەی کە منداڵی گەورەیان بووە و تووشی دڕان بوون سەرباری دادڕینی بندامێن بریتی بووە لە (٣٢.٤٪) و لە نێو ئەو نافرەتانەی منداڵی بچوکیان بووە، ڕێژەکە بریتی بووە لە (٢٢.٧٪) ($p = 0.013$). لە هەموو نافرەتەکاندا، ڕێژەی دڕانی زێ بریتی بووە لە ٣٣.٣٪ بێ گوێدانە ئەوەی داخۆ دادڕینی بندامێنیان بۆ ئەنجام دراوە یان نا. لەو نافرەتانەی کە دادڕینی بندامێنیان بۆ ئەنجام دراوە، ڕووداوی دڕان بە ڕێژەیەکی بەرچاو بەرز بووە (٣٥.٣٪)، بە بەراورد بە ئەو نافرەتانەی (٢٧.٦٪) کە کردەکەیان بۆ ئەنجام نەدراوە ( p

0.006 =). شیکردنەوەی گەرانەوەیی لۆجیستیی دووانەیی ئەوەی دەرخست کە کردەی دادڕینی بندامێن دەکرێت ببێتە هۆی زیادکردنی مەترسیی دڕان بە ڕێژەی زیاتر لە ٣٠٪ یان (1.798 - 1.045 95%nCl ;1.37 =). هیچ پەیوەندییەکی بەرچاو نەدۆزرایەوە لە نێوان پەرسەندنی دڕان لەگەڵ تەمەن، جارەکانی منداڵبون و، کێشی مندالەکە. توێژینەوەکە بەوە گەیشت کە تەمەنی دایك و جارەکانی منداڵبوون و کێشی منداڵەکە پەیوەندییان هەیە بە هۆکارەکانی مەترسی بۆ ئەو ژامارییانەی بندامێن کە دەبنە هۆی دڕانی زێ یان کردەی دادڕینی بندامێن. بەربڵاویی کردەی دادڕینی بندامێن لەم توێژینەوەیەدا بە ئەندازەیەکی بەرچاو زیاترە لەوەی کە ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی (WHO) پێشنیاری دەکات. دەرەنجامەکانی ئەم توێژینەوەیە پێشنیاری ئەوە دەکات کە لێکۆڵینەوەی زیاتر پێویستن بۆ زانیاریدان و دانان و جێبەجێکردنی ئەو سیاسەتانەی پەیوەستن بە بەکارهێنانی سنورداری کردەی دادڕینی بندامێن (Ahmed et al., 2019).

لە توێژینەوەیەکی پانەبڕگەیی (cross-sectional) دیکە کە لە هەمان نەخۆشخانە ئەنجام دراوە، زۆرینەی ئافرەتەکان لە تەمەنیان لە نێوان ٢٠ و ٣٥ ساڵان بوون و، نزیکەی نیوەیان (٤٨.٦٪) زیاتر لە سکێکیان بووە، ٦٢.١٪ یان پێشتر دادڕینی بندامێنیان بۆ ئەنجام دراوە و ٨.٤٪ یان و تووشی دڕانی بندامێن بوون. ڕێژەی ئەنجامدانی دادڕینی بندامێن بریتییە لە ٤٤.٢٪ و ڕێژەی بریندارپوونی بندامێن بریتییە لە ١٨.٤٪. زۆربەی نیشانە بەڵگەکانی ئەنجامدانی کردەی دادڕینی بندامێن بریتی بووە لە توندی و جیڕبوونی بندامێن (٦٥.٦٪). نیشاندەرەکانی دیکە بریتی بوون لە ماندووبوون و شەکەتبوونی دایکەکە، ڕێکاری ڕۆتینی بۆ حاڵەتەکانی منداڵبوونی سروشتی لە ڕێگەی زێوە، کۆرپەڵەی گەورە و، مێژووی پێشینە لە بریندارپوونی بندامێن، منداڵبوونی بریچ (دەرچوونی کۆرپەڵەکە بە قووندا) و، دەرکەوتنی دەموچاو (Face presentation). ئەم توێژینەوەیە پەیوەندییەکی گرنگ دەردەخات لە نێوان ڕێژەی کردەی دادڕینی بندامێن و تەمەن و، ئاستی خوێندەواری/هۆشیاری و، پیشەی ئافرەتانی بەشدار. ئەم توێژینەوەیە پەیوەندییەکی گرنگ نیشان دەدات لە نێوان ڕێژەی ئێستای دادڕینی بندامێن و ڕێژەی ئێستای بریندارپوونی ودڕانی بندامێن. دەرەنجامەکان ئەوە دەردەخەن کە (٨.٦٪)ی ئافرەتە دووگیانەکان دادڕینی بندامێنیان بۆ ئەنجام دراوە و تووشی

درانی بندامێن بوون بە بەراورد بە (٢٦.٢٪)یان کە دادرینی بندامێنیان بۆ ئەنجام نەدراوە (Ali and Zangana, 2016).

توێژینەوەیەکی پانەبڕگەیی (cross-sectional) لە نەخۆشخانەی لەدایکبوون لە شاری دهۆك ئەنجام درا؛ توێژینەوەکە کۆی ١٢،٣٠٥ حاڵەتی منداڵبوونی سروشتی لەخۆ گرتبوو. مەودای تەمەنی نیوەی نمونەکانی ئەم توێژینەوەی لە نێوان ٢٣ و ٣٠ساڵان بووە، لە کاتێکدا ٣٣٪ یشیان ١٥ بۆ ٢٢ ساڵ بوون. ژمارەی حاڵەتەکانی نۆبەرە (یەکەم منداڵبوون) بریتی بووە لە ٣٦٨٥ (٣٠٪) و حاڵەتەکانی منداڵبوونی چەندبارەیش بریتی بوون لە ٨٦٢٠ (٧٠٪). ریژەی دادرینی بندامێن بریتی بووە لە ٦٣٪ و درانی بندامێن ٣٥.٨٪ و هەردووکیشیان پێکەوە ١.٢٪ بووە. هەروەها دەرەنجامەکان ئەوە دەردەخەن کە ٨٩.٨٪ی ئەو کۆرپانەی کە بە سروشتی لەدایك بوون کێشیان لە نێوان ٢٥٠٠-٤٠٠٠ گرام بووە. زۆری و بەربڵاو کردەی دادرینی بندامێن زیاتر لە نێو ئەو دایکانە بووە کە سکی یەکەمیان بووە بە ریژەی (٧١.٨٪). لێکۆڵەوەران بە ئەو ئەنجام گەیشتوون کە کارمەندانی چاودێری تەندروستی پێویستییان بە بەردەوامیدان بە خوێندن و خولی راهێنان هەیە لەپێناو سنوردارکردن و کەمکردنەوەی ریژەی دادرینی بندامێن (Fatah & Abdulmalek, 2019).

ئەزموون و هۆشیاریی ئافرەتانی کورد لە ژانگرتن و منداڵبوون سەبارەت بە دادرینی بندامێن

توێژینەوەیەك بە مێتۆدی تێکەڵی زینجرەیی روونکردنەوەیی (Explanatory sequential mixed method) لەسەر ٢٥٦ ئافرەت ئەنجام درا کە لە یەکێک لە نەخۆشخانە حکومییە گەورەکان لە هەرێمی کوردستان منداڵیان بووە. ئەم توێژینەوەیە هەڵسەنگاندنێکە بۆ ئەزموونی ژانگرتن و منداڵبوون لای ئافرەتانی کورد. ئەم توێژینەوەیە دەریدەخات کە ریژەی دادرینی بندامێن هێشتا زۆرە، نزیکەی ٤٤٪ دادرینی بندامێنیان بۆ ئەنجام دراوە. داتاکان وەها دەردەخەن کە ئافرەتان باوەریان وەهایە کە هەر کار و رۆتینێك کە لە ماوەی ژانگرتندا بۆیان ئەنجام دراوە بەشێکی ئاسایی بووە لە پرۆسەی

منداڵبوونەکەیان. ئەم کارە رۆتینیانەش بریتین لە پشکنینی زێ یان بەشێك لە دەستتێوەردانی پزیشکییەکان و نەشتەرگەریانە وەك دادرینی بندامێن. ئەو هۆکارانەی کە ئەزموونی منداڵبوونی ئافرەتان بە نەرێنی دەکەن ئەو دەستتێوەردانی نەشتەرگەریانە دەگرێتەوە وەك دادرینی بندامێن و تەقەڵدان. هەروەها، ئافرەتان هەندێ پەرۆشیان باس کرد لەبارەی دواکەوتنی تەقەڵدانی برینی دادرینی بندامێن، ئاماژەیان بەوە داوە کە ئەم دواکەوتنە بووەتە هۆی زیاتربوونی نارەحەتیان و ئەوەیشیان ووتووە کە هەستیان بە ئازاری زیاتر کردووە لە حاڵەتی ئەوەی کە برینی دادرینی بندامێن بۆ ماوەیەکی درێژ بێ تەقەڵدانەوە هێڵدرابێتەوە (محمود، ٢٠١٦).

### پێویستی بە دادرینی بندامێن لە نۆبەرەییدا

توێژینەوەیەکی داهاتوویی (prospective) لە نەخۆشخانەی فێرکاریی منداڵبوون لە شاری سلێمانی ئەنجام درا بە مەبەستی هەڵسەنگاندنی ئاکامی ١٥٢ ئافرەت بە سکی نۆبەرەی ماوە تەواو لە قاوشی ژانگرتووانی نەخۆشخانەی فێرکاریی منداڵبوون لە سلێمانی بوون. گشت حاڵەتەکان لە ماوەی ژانگرتنیاندا لە هۆڵی مندالبوون کۆکرانەوە لە پاش وەرگرتنی تەواوی پاشخان و پشکنینی پزیشکیی، هەڵسەنگاندنی دۆخی حەوز (سێبەند)، هەروەها لە پاش هەڵسەنگاندنی قەبارەی کۆرپەڵەکە و، دوای پرسین لە نەخۆشەکە داخۆ قەبوڵی دەکات دادرینی بندامێنیان بۆ ئەنجام بدرێت. لە پاش منداڵبوونەکە داوا لە ئافرەتەکان کراوە فۆرمێکی راپرسی پڕ بکەنەوە. چاودێری و بەدواداچون لە دوای ٢٤ کاتژمێر، لە دوای ١ هەفتە و، دوای شەش مانگ ئەنجام دراون بۆ ئافرەتەکە بە مەبەستی دەستنیشانکردنی هەر کێشەیەکی دوای منداڵ بوونەکە وەك خوێنڕێژیی دوای منداڵبوون، خوێن مەیین لە بندامێن، ئازار لە بندامێن، کێشەی مێزکردن، دانانەوە لە زێوە، مێز یان پیسایی رانەگرتن.

لە دوای ٦ هەفتە پرسیار لە ئافرەتەکان کراوە داخۆ هیچ ئازارێکیان هەبووە لە کاتی سەرجێیکردن (dyspareunia). ئەنجامەکان بە ئەم شێوەیە بوون: ٥٣ حاڵەت (٣٤.٩٪) بندامێنیان تێك نەچووە (گرووپی ١)، ٦٥ حاڵەت (٤٢.٨٪) بە پلەی یەکەمی درانی بندامێنیان هەبووە (گرووپی ٢) و، ٣٤ حاڵەت (٢٢.٤٪) بە پلەی دووەمی درانی بندامێن بوون (گرووپی

٣). هيچ حاڵەتێکی پلەی سێیەم و چوارەمی دڕانی بنداميَن نەبووە. تێکڕای تەمەنی ئافرەتەکان بریتی بوو لە ٢١.٦ ساڵ، ٢٢.٨ ساڵ و ٢٢.٢ ساڵ بە ریز بۆ هەر سێ گروپەکە. شەست و نۆ حاڵەت (٤٥.٣٩٪)ی ئافرەتەکان پێویستییان بە دووریینەوە/تەقەڵدانەوە نەبووە (٥٣ لەوانە بنداميَنیان تێکنەچووە و ١٦ حاڵەتیان تەنها هەندێ دڕانی پەردەیی رووکەشیان هەبووە). چل و دوو حاڵەت (٢٧.٦٪) تووشی دڕانی دیوی ناوەوە و دیوارەی لاتەنیشتی زێ بوون (٣١ حاڵەت لە دڕانی پلەی یەك و ١١ حاڵەتیش لە پلە دوو). کێشی تێکڕایی کۆرپەڵەکان بریتی بووە لە نێوان ٣.٠٨ کیلۆگرام و ٠.٣٦ کیلۆگرام. پەیوەندیی نێوان کێشی کۆرپەڵەکان و ئەگەری روودان و پلەی دڕانەکان لە رووی ژمارەوە جێی بایەخ بوون. گشت حاڵەتەکانی هەر سێ گروپەکە پێویستیان بە تەقەڵدانەوە بووە. ئەو ئافرەتانە لە کاتی دانیشتندا لە دوای ٢٤ کاتژمێر تووشی ئازاری بنداميَن و ناڕەحەتی بوون. لە بەدواداچوونی دوای ٦ هەفتە، تەنها ٢ حاڵەت هەبوون کە تووشی کێشەی ڕانەگرتنی میز و پیسایی یان ئازاری سەرجێی (dyspareunia) بوون. دەرەنجامەکانی ئەم توێژینەوەیە دەریدەخات کە دادڕینی بنداميَن هەموو کات ڕێبازێك نەبووە ڕێگری بکات لە زامداریی بنداميَن ( Saeid et al., 2014).

## بەشی چوارەم

# کرداری پشتبەستوو بە بەڵگە و ڕێنمایی پێوەری سەبارەت بە دادڕینی بندامێن

د. کەژان ابراهیم محمود

## دۆخی ئێستای بەڵگەکان

دادڕینی بندامێن (Episiotomy) زۆر لە مێژە بووەتە بابەتی باسی نێوان توێژەرەوان و پزیشکان و داکۆکیکاران. شێوازی رۆتینیی بەکارهێنانی دادڕینی بندامێن بۆ رێگریکردن لە دڕانی ناسایی زێ پێشتر بە رێنماییە پزیشکییەکان پێشنیار دەکرا (ئێستا بەسەر چوون). لە دوو دەیەی رابردوودا، دەستەیەکی هەڵکشاو لە زانیاریە چاپکراواکان و هەوڵە داکۆکیکارەکان بووە هۆی هێنانەدیی کۆدەنگییەك لەسەر ئەوەی کە نابێت دادڕینی بندامێن وەك کردارێکی پێوەری ئەنجام بدرێت. لەگەڵ ئەوەشدا، لە زۆر جێگای جیهاندا، زۆرینەی نافرەتان لە کاتی منداڵبوونیاندا کرداری دادڕینی بنداممێنیان بۆ ئەنجام دەدرێت.

لە رابردوودا، یەکێك لە هەرە باوترین نەشتەرگەرییەکان لە زانستی منداڵبووندا بریتی بوو لە دادڕینی بنداممێن (Lappen & Gossett, 2010). بە پێی بەڵگەی زیادبوونی ئاڵۆزییەکانی بەکارهێنانی دادڕینی بنداممێن، وای لێهات بەکارهێنانە رۆتینییەکەی پەراوێز بخرێت و چیدیکە بەکار نەهێنرێت. پێشنیاری رێکخراوی تەندروستی جیهانی (WHO) بۆ رێژەی ئەنجامدانی دادڕینی بنداممێن لە ١٠٪، لە ساڵی ١٩٩٦، هەوڵەکانی چڕ کردەوە بۆ دابەزاندنی رێژەی زۆری دادڕینی بنداممێن. لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، تێکڕای رێژەکە لە ١٧.٣٪ دابەزی بۆ ١١.٣٪ لە ماوەی ساڵەکانی ٢٠٠٦ بۆ ٢٠١٣ (Berkowitz, 2017; ICEA, 2017; Friedman et al., 2015).

بە گوێرەی (Beech ، 2004)، بەربڵاوی بەکارهێنانی دادڕینی بنداممێن لە بەریتانیا و ئەمریکا بە هۆی بەرزبوونەوەی رێژەی بەڕێوەبردنی چالاکانەی منداڵبوون (Active management) بووە. زۆر دەستپێشخەریی دیکە بوونە پێویستی لەگەڵ ئەوەی کە ژانگرتن و منداڵبوون لەوەی کە وەك پرۆسەیەکی فیسیۆلۆجی تەماشا بکرێت بووە پرۆسەیەکی نەخۆشی یان پاتۆلۆجی. ئەم هۆکارانەی خوارەوە بەشدارن لە دەستبردن بۆ ئەنجامدانی دادڕینی بنداممێن:

1. کەمکردنەوەی کۆست لەسەر سەری کۆرپەڵەکە،
2. بە ئاسانی چاك دەکرێتەوە و برینەکەی باشتر سارێژ دەبێتەوە،
3. پاراستنی ئەو ماسولکە و چینانەی (fascial) کە پاڵپشتیی بنەوەی حەوز دەکەن.

4. ڕێگریکردن لە دڕانی ماسولکەی بەیەکهێنەری کۆم.
5. ڕێگریکردن لە منداڵبوونی زەحمەت بە ناراستەی شانەکان (عاسیبوونی شانەکان) (ICEA, 2017)

بێرکۆیتز و ئەوانی دیکە (2017) رایانگەیاند کە توێژینەوەی بەردەوام دەریخستووە کە بەکارهێنانی دادڕینی بندامێن (episiotomy) هیچ سوودێکی نابێت بۆ ئەو هۆکارانەی سەرەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، دادڕینی بندامێن ئافرەتان دەخاتە بەدەم ئەم ئاکامە نەخوازراوانەی خوارەوە:

1. درێژبوونەوەی درزی برینەکە تا گەیشتنی بە دڕانی پلە سێ و چوار، بە زۆریش لە حاڵەتی دادڕینی بندامێن لە ناوەڕاستەوە (median episiotomy).
2. مەترسیی دروستبوونی ئاکامی تونێکاریی نەخوازراو (بۆ نمونە، تەسکبوونەوەی دەمی زێ، گرێی پێست، دروستبوونی ناسور/کون و، دروستبوونی ناڕێکی/ناهاوتایی).
3. بەرزبوونەوەی ڕێژەی هەوکردنی برین و کرانەوەی برین.
4. زیادکردنی لەدەستدانی خوێن.
5. زیادبوونی مەترسیی ڕوودانی دڕانی سەخت لە بندامێن بۆ منداڵبوونی داهاتوو (ICEA, 2017).

پێداچوونەوەیەکی تازەی ڕێکخراوی کۆکرەین (Cochrane) پشتیوانیی ئەو دەرەنجامانە دەکات کە بەکارهێنانی ڕۆتینیی دادڕینی بندامێن (episiotomy) هیچ سوودێکی نییە و بگرە ئەگەری ئاکامی پێچەوانەیشی هەیە بەپێی ڕاپۆرتێکیان کە لە ساڵی ٢٠١٧ دەرچووە (Jiang et al., 2017). ئەم پێداچوونەوەیە بە ١١ تاقیکردنەوە (٥٩٧٧ ئافرەت) چەند حاڵەتێکی هەڵبژاردەیی لەگەڵ ڕۆتینیی دادڕینی بندامێن بەراورد کردووە بۆ ئەو ئافرەتانەی لە بەر مەترسییەکی نزمی منداڵبوونن بە بەکارهێنانی ئامراز (instrumental delivery) لە ١٠ وڵاتی جیاوازدا. نوسەرەکان بەو ئەنجامە گەیشتوون کە: "بە گشتی، ئەنجامە دۆزراوەکان ئەوە دەردەخەن کە دادڕینی بندامێن بە شێوەی هەڵبژاردەیی بۆ ئافرەتان (لە کاتێکدا کە منداڵبوونی ئاسایی بە بێ ئامرازی گیرە پێشبینی دەکرێت) بە واتای ئەوە دێت کە

ژمارەیەکی کەمتری ئافرەتان تووشی زامداری/تراومای سەختی بندامێن دەبن. بەم شێوەیە هۆکاری سەرەکی بۆ ئەنجامدانی دادڕینی بندامێن بە شێوەی ڕۆتینی بە مەبەستی ڕێگریکردن لە زامداری سەختی بندامێن پاساودار نابێت بە پێی بەڵگە هەنوکەییەکان و، ئێمەش نەمانتوانیوە سوودێکی دادڕینی بندامێن دەستنیشان بکەین نە بۆ منداڵەکە و نە بۆ دایکەکەش(Jiang et al., 2017) ".

داتاکان هیچ سوودێکی کورتخایەن یان درێژخایەنی دادڕینی ڕۆتینی نیشان نادەن لە خراپ کارکردنی بنەوەی حەوز (pelvic floor dysfunction) ، سەختیی دڕان لە بندامێن، یان لە لەجێچوون یان شۆڕبوونەوەی ئەندامانی حەوز بە بەراورد لەگەڵ بەکارهێنانی سنورداری دادڕینی بندامێن. هەروەها، دادڕینی بندامێن هاوتایە لەگەڵ مەترسییەکی زۆر لە کێشەی خۆڕانەگرتن لە کۆم بۆ ماوەی دوای منداڵبوون (ACOG, 2016).

ڕۆدریگز و هاوەڵەکانی (2008) تاقیکردنەوەیەکی هەڕەمەکیی کۆنترۆڵکراوی نەخۆشخانەییان لەسەر ٤٤٦ ئافرەت ئەنجام دا کە یەکەم منداڵبوونیانە و لە دوای ٢٨ هەفتەی دووگیانی منداڵیان بووە. نەخۆشەکان بە هەڕەمەکی دانراون بۆ ئەنجامدانی دادڕینی بندامێن بە شێوەی ڕۆتینی یان بە شێوەی هەڵبژاردەیی. لە گرووپی دادڕینی بندامێن بە شێوەی هەڵبژاردەی (selective episiotomy)، کرداری دادڕینەکان تەنها لە نەو حاڵەتانەدا ئەنجام دراون کە نزیك بوون لە دڕان، لە حاڵەتی منداڵبوون بە ئامرازی گیرە، یان لە حاڵەتی شپرزەیی کۆرپەلە (fetal distress). سیاسەتی ئەنجامدانی دادڕینی بندامێن لە هێڵی ناوەڕاست بە شێوەی هەڵبژاردەیی بۆ ئافرەتانی نوبەرە دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی مەترسییەکانی دڕانی بندامێن (perineal lacerations) (بە پلە سێ) ( Rodriguez et al., 2008).

پێداچوونەوەیەکی سیستماتیکی لە ساڵی ٢٠٠٥ (Carroli and Belizan, 2005) بەو ئەنجامە گەیشت کە ئازار، سەختیی دڕانی بندامێن و بەکارهێنانی دەرمانی ئازارشکێن باشتر نەبوون لەگەڵ بەکارهێنانی دادڕینی بندامێن بە شێوەی ڕۆتینی. هەروەها، هیچ سوودێکی جێگیر لە ئەنجامدانی دادڕینی بندامێن بە شێوەی ڕۆتینی نەبووە بۆ ڕێگریکردن لە ڕانەگرتنی میز یان پیسایی، یان بۆ شۆڕبوونەوەی بنەوەی حەوز. پێداچوونەوەیەکی

ڕێکخراوی کۆکرەین (Cochrane) لەلایەن هارتمان و ئەوانی دیکە لە ساڵی ٢٠٠٩ بە هەمان ئەو دەرئەنجامانە گەیشت و، هەروەها بە ئەوەیش کە بەکارهێنانی دادڕینی سنورداری بندامێن پەیوەندیدار بووە بە تەقەڵدانی کەمتر و کێشە و ئاڵۆزیی کەمتری سارێژبوونەوە بە بەراورد بە شێوەی ڕۆتینییەکە.

تاقیکردنەوەیەکی هەڕەمەکیی نەخۆشخانەیی لە بەرازیل ئەنجام درا لەلایەن ئامۆریم (Amorim) و کەسانی دیکە لە ساڵی ٢٠١٧، بە مەبەستی بەراوردکردنی ئاکامەکانی دایکایەتی (maternal) و ئاکامەکانی نزیك ماوەی منداڵبوون (perinatal) لەو ئافرەتانەی خراونەتە بەر پرۆتۆکۆلی ئەنجامنەدانی دادڕینی بندامێن بەرانبەر بە ئەوانەی خراونەتە بەر کردەی دادڕینی بندامێن بە شێوەی هەڵبژاردەیی. توێژینەوەکە لەسەر ١١٥ ئافرەت (کە دانراون بۆ پرۆتۆکۆلی ئەنجامنەدانی دادڕینی بندامێن) و ١١٢ ئافرەتی دیکە (کە دانراون بۆ دادڕینی بندامێن بە شێوەی هەڵبژاردەیی) ئەنجام دراوە. هیچ جیاوازییەك نەبووە لە نێوان هەردوو گروپەکەدا سەبارەت بە ئاکامەکانی پەیوەست بە دایکایەتی و ماوەی منداڵبوون. ڕێژەی دادڕینی بندامێن یەکسان بووە (بە دوو حاڵەت لە هەر گروپێکدا، بە نزیکەی ١.٧٪)، ئەوانیش لە ماوەی قۆناغی دووەمی ژانگرتندا بوون، لە حاڵەتی دووبارەبوونەوەی دڕانی بندامێن (perineal tears)، زامداری/بڕینی سەختی بندامێن (perineal trauma)، پێویستکردن بە تەقەڵدانی بندامێن و، لەدەستدانی خوێن لە کاتی منداڵبووندا. ئامۆریم (Amorim) و هاوڵەکانی بەو دەرئەنجامە گەیشتن کە پرۆتۆکۆلی ئەنجامنەدانی دادڕینی بندامێن دەرکەوت سەلامەتە بۆ دایکەکە و منداڵەکە و، تەئکیدیان کردەوە لە پێویستی لێکۆڵینەوە لەسەر ئەوەی داخۆ لە ڕاستیدا هیچ نیشاندەرێك هەیە بۆ ئەم کردارە.

لەگەڵ ئەوەشدا، لە هەندێ حاڵەتی تایبەتدا، ئەنجامدانی دادڕینی بندامێن دەکرێت ببێتە هۆی ڕزگارکردنی ئافرەتان. بۆ نمونە، توێژینەوەیەکی پشتبەستوو بە کۆمەڵێك داتای کۆکراوە لە چەندین نەخۆشخانە لە باشوری بیابانی گەورەی ئەفریقیا بە ئەو دەرئەنجامە گەیشت کە دادڕینی بندامێن ڕزگارکەر بووە لە بەرانبەر بە خوێنڕێژیی دوای منداڵبوون و لە دڕانی ماسولکەی بەیەکهێنەری کۆم لە نێو ئەو ئافرەتانەی دووچاری جۆری سێیەمی شێوانی

کۆئەندامی زاوزێی مێینە بوون (female genital mutilation ) (Rodriguez et al.,
2016).

**بەڵگە و ئامۆژگارییە هەنوکەییەکان**

بە گشتی، دادڕینی بندامێن لە ئێستادا لەسەر بنەمای تاکەکەسی ئەنجام دەدرێت. کاتێك کە دۆخی تەندروستی ئافرەتەکە بخاتە بەردەم مەترسییەکی زۆری پلەی سێیەم و چوارەمی دڕان، ئەوکات دادڕینی بندامێن لەبەرچاو دەگیرێت. هەروەها، کاتێك کە رادەی لێدانی دڵی کۆرپەکە کێشەی هەبێت، باوەڕ وەهایە کە پەلەکردن لە پرۆسەی منداڵبوونەکە لە رێگەی زێوە باشتر دەبێت بۆ کۆرپەکە (بۆ نمونە، بە ئەنجامدانی دادڕینی بندامێن) (ICEA, 2017).
کاتێك کە دادڕینی بندامێن پێویست دەبێت، زۆر گرنگە کە تەئکید بکەیتەوە لەوەی کە ئافرەتەکان بەشداری پێبکرێن لە پرۆسەی بڕیاردانەکە. ئەنجامدانی هەر کردارێکی دادڕینی بندامێن (یان هەر کردارێکی دیکە) بە بێ رەزامەندیی هۆشمەندانەی ئافرەتەکە پێشێلکردنی مافی ئەوە سەبارەت بە بابەتی چاودێریی دایکایەتی (WHO, 2015). چارەکردنی بەکارهێنانی کرداری دادڕینی بندامێن پشتبەستوو بە بەڵگە گرنگە بۆ باشترکردنی تەندروستی دایکایەتی و ئەزموونەکانی منداڵبوونی ئافرەتان لە سەرانسەری جیهاندا.
کاتێك کە کردارێکی دادڕینی بندامێن پێویست دەبێت، زۆر گرنگە کردارەکە بە جۆرێك ئەنجام بدرێت کە کاریگەرییەکانی لەسەر دایکەکە و منداڵەکە ئەوپەڕی کەم بکرێتەوە. دەرەنجامی ئەو زانیاریە چاپکراوەکان ئەوەیە کە بە نەبوونی داتا و زانیاریی تەواو بۆ دانانی پێوەری پشتبەستوو بە بەڵگە بۆ ئەنجامدانی دادڕینی بندامێن، بۆچوونی پزیشکی ( clinical judgment) دەبنە باشترین رێنیشاندەر بۆ بڕیاردان لەوەی داخۆ بەکارهێنانی ئەو کردارە مسۆگەر یان زامنکراوە. (ICEA, 2017; ACOG, 2016)
بە گوێرەی کۆلێژی ئەمریکی بۆ پزیشکانی ئافرەتانی دووگیان و نەخۆشی ئافرەتان (ACOG) لە ساڵی (٢٠١٦)، "بە پشتبەستن بە بەڵگەی بەردەست، هیچ دۆخێکی دیاریکراو نییە کە بە هۆیەوە دادڕینی بندامێن کردارێکی بنەڕەتی بێت و، بڕیاردان لە ئەنجامدانی هەر دادڕینێکی بندامێن دەبێت پشتبەستوو بێت بە سەرنجە پزیشکییەکان/کلینیکییەکان."

## ڕاسپاردەکان

تازەترین ڕاسپاردەکانی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی لەسەر سیاسەتی کرداری دادڕینی بندامێن ڕایدەگەیەنێت کە "بەکارهێنانی ڕوتینی بۆ ئەنجامدانی دادڕینی بندامێن پێشنیار ناکرێن بۆ ئەو ئافرەتانەی دەیانەوێت بە سروشتی لە ڕێگەی زێوە منداڵیان ببێت. "( WHO, 2018a). ئەم پێشنیارە لەسەر بنەمای ئەو ڕاستییە دانراوە کە زۆربەی بەڵگەکان لەسەر کاریگەرییە بەراوردکارییەکانی تایبەت بە سیاسەتەکانی دادڕینی بندامێنن کە لە بەکارهێنانی دادڕینی بندامێن لە شێوەی هەڵبژاردەیی/سنووردار بەرانبەر بە شێوەی ڕوتینی/باو وێنا دەکرێت. چەند کاریگەرییەکی سوودبەخشی دۆکیومێنتکراوی شێوەی هەڵبژاردەیی/سنورداری سیاسەتی دادڕینی بندامێن هەبووە بە بەراورد بە شێوەی ڕوتینی/باو. لەگەڵ ئەوەشدا، کەمی بەڵگە لەسەر کاریگەریی دادڕینی بندامێن بە گشتی و، پێویستی بە کەمکردنەوەی ڕێژەی بەرزی ئەنجامدانی دادڕینی بندامێن بە شێوەی ڕوتینی لە هەموو حاڵەتەکاندا، وای لە ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی کردووە پێشنیاری ئەوە بکات کە دادڕینی بندامێن بە شێوەی ڕوتینی بە "پێشنیارنەکراو" دابنێت و، لە بری ئەوەش پێشنیاری بەکارهێنانی دادڕینی بندامێن بە شێوەی هەڵبژاردەیی/سنورداری دەکات.

ئەو پەیڕەوەی سەرەوە (WHO, 2018a) هەروەها دەڵێت زەحمەتە ڕێژەیەکی "پەسەندکراو" بۆ ئەنجامدانی دادڕینی بندامێن دیاری بکرێت. ڕۆڵی دادڕینی بندامێن لە حاڵەتی تەنگاوی/ئیمێرجینسیی منداڵبووندا وەك ئەو حاڵەتانەی کۆرپەلەی شپرزە/عاسیبوو ( fetal distress) کە پێویست بە لەدایکبوون بە ئامراز دەکات، وەك بژاردەیەك دەمێنێتەوە دادڕینەکە ئەنجام بدرێت. لەگەڵ ئەوەشدا، بەردەستبوونی بەنجێکی خۆجێیی کاریگەر و بە ڕەزامەندیی هۆشمەندانەی ئافرەتەکە دوو بنەمای پێویستن کاتێك کە دادڕینی بندامێن ئەنجام دەدرێت. دادڕینی/شەقکردنی لە ناوەندەوە بۆ لاتەنیشت بە تەکنیکێکی خوازراو دادەنرێت، چونکە دادڕین یان شەقکردن لەسەر هێڵی ناوەڕاست مەترسی زیاتری لێ دەبێتەوە بۆ حاڵەتی منداڵبوونی ئاڵۆز (complex obstetric) یان بۆ برینداربوونی ماسولکەی بەیەکهێنەری کۆم (OASI) (sphincter injury). سەبارەت بە تەکنیکی تەقەڵدان، تەکنیکی تەقەڵدانی بەردەوام بە پەسەندتر دەزانرێت لە تەکنیکی پچڕپچڕ (WHO, 2018a). ئەگەر

هەر گومانێك هەبێت سەبارەت بە دڕان لە پلەی سێ یان چوار، ئەوا وەها بە باش دەزانرێت کە بە پلە بەرزترەکە دابنرێت لەوەی کە بە پلە نزمەکە پۆلێن بکرێت ( RCOG, 2015).

پێشنیار و ئامۆژگارییە هەرە تازەکانی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی لەسەر خۆپارێزی ئانتیبیۆتیکیی ڕوتینی لە دادڕینی بندامێن ئەوەیە کە "خۆپارێزی ئانتیبیۆتیکیی ڕوتینی پێشنیار ناکرێت بۆ ئەو ئافرەتانەی کە دادڕینی بندامێنیان هەبووە." (WHO, 2018b). ئەم ڕاسپاردەیە تایبەتە بە بەکارهێنانی ئانتیبایۆتیك لە پێش یان ڕاستەوخۆ لە پاش چاککردنەوەی دادڕینی بندامێن لە دوای منداڵبوون لە ڕێگەی زێوە. ئانتیبایۆتیکەکان دەبێت تەنها لەو کاتانەدا بێت کە ئاماژەی پزیشکی/کلینیکی هەبن سەبارەت بە هەوکردنی برینی دادڕینەکە. دڕانی پلەی دووی بندامێن (perineal tear) بۆ خۆی هاوشێوەی کرداری دادڕینی بندامێنیە و پێویست بە بەکارهێنانی ئانتیبایۆتیکی خۆپارێزی ناکات.

پێشنیاری/ڕاسپاردەی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی لەسەر خۆپارێزیی ئانتیبایۆتیکی ڕوتینی بۆ ئەو ئافرەتانەی دڕانی بندامێنیان هەیە بە پلەی سێ یان چوار ئەوە پێشنیار دەکات کە دەبێت ئانتیبایۆتیکی خۆپارێزی لەو حاڵەتاندا بدرێت کە برینی دادڕینی بندامێن (episiotomy) فراوان دەبێتەوە بۆ دڕانی بندامێن (perineal tear) بە پلەی سێ یان چوار (WHO, 2015).

هەروەها، پەیڕەوی کۆلێژی شاهانەی پزیشکانی ئافرەتانی دووگیان و نەخۆشی ئافرەتان (RCOG) سەبارەت بە چارەکردنی دڕانی بندامێن (perineal tear) لە پلەی سێ یان چوار (Green-top Guideline No. 29) پێشنیاری ئەوە دەکات کە دەبێت دادڕینی ناوەڕاست بۆ لاتەنیشت لەبەرچاو بگیرێت بۆ حاڵەتەکانی منداڵبوون بە ئامراز ( instrumental deliveries). لە حاڵەتێکدا کە کردەی دادڕینی بندامێن دادەنرێت، تەکنیکی ناوەڕاست بۆ لاتەنیشت پێشنیار دەکرێت، ئەمەیش لەگەڵ تێبینیکردنی ووردی پلەکەی. گۆشەکەی دەبێت ٦٠ پلە بێت لە هێڵی ناوەڕاستەوە کاتێك کە ناوچەی بندامێن/خوارووی زێ (perineum) هەڵدەئاوسێت. هەروەها پێشنیاری ئەوە دەکات کە پەستاندنی گەرم لە ماوەی قۆناغی دووەمی ژانگرتن مەترسیی برینداربوونی ماسولکەی بەیەکهێنەری کۆم (OASI) کەم دەکاتەوە RCOG, 2015). )

پزیشك و پەرستارە کردارییە بێ ئەزموونەکان وورد و دروست نابن لە مەزەندەکردنی ئەو گۆشەیە لە کاتی دادڕینی بنداملیندا و، پێناچێت زۆر گرنگی بە گۆشەکە بدەن. لەبەر ئەوەش، دەبێت خولی ڕاهێنانی تایبەتیان پێ بدرێت بۆ پەرەپێدانی ووردی و دروستییان لە مەزەندەکردنی گۆشەکە. دادڕینی بندامێن لەسەر هێڵی ناوەڕاست بە هۆکاری مەترسی دادەنرێت بۆ ڕوودانی برینداربوونی ماسولکەی بەیەکهێنەری کۆم ( OASIS) (Queensland Clinical Guidelines, 2017).

**ئاماژەکانی پێویستی بە دادڕینی بندامێن لە ناوەڕاست بۆ لاتەنیشت**

کۆلێژی شاهانەی ئوستراليا و نیوزلەندا بۆ پزیشکانی ئافرەتانی دووگیان و نەخۆشی ئافرەتان (RANZCOG) هانی بەکارهێنانی ڕۆتینی نادات بۆ ئەنجامدانی کردەکانی دادڕینی بندامێن. هەردوو پەیڕەوکانی (RANZCOG، 2017) و پەیڕەوە پزیشکییەکانی کوینزلاند (2017) پێشنیاری ئەم خاڵانەی خوارەوە دەکەن سەبارە بە کردەی دادڕینی بندامێن.

بۆ ئەم حاڵەتانەی خوارەوە، ئەنجامدانی دادڕینی بندامێن لەبەرچاو بگرە:

- ئەگەر گومانی شپرزەیی یان کێشە لە کۆرپەڵەکەدا بکرێت و پێویست بکات منداڵبوونەکە خێراتر بکرێت.
- ئەگەر پێویست بە منداڵبوون بە ئامراز بکات (ڕەنگە بیپارێت لە برینداربوونی ماسولکەی بەیەکهێنەری کۆم (OASIS) لە حاڵەتی منداڵبوون بە ئامراز)
- ئەو ئافرەتانەی ئەزموونی شێوانی کۆئەندامی زاوزێی مێینەیان هەیە.
- ئەگەر ئەستەمی منداڵبوون هەبێت بە هۆی شانە نەرمەکان (soft tissue dystocia)
- ئەگەری هەبێت یان پێشبینی برینداربوونێکی سەخت بکرێت (بۆ نموونە، ئەگەر ئەگەری زۆر هەبێت بۆ دڕانی بندامێن لە پلەی سێ یان چوار).
- ئاماژە هەبێت لەسەر دۆخی پزیشکی دایکەکە بە تایبەت بە کورتبوونەوەی قۆناغی دووەم
- داواکاریی ئافرەتەکە.

**بنەماکانی دادڕینی بندامین لە کاتی پێویستدا (Episiotomy technique principles)**

ئەگەر پێشنیاری دادڕینی بندامین کرا، ئەوا پێویستە ئەم بنەما تەکنیکییانە دادڕینی بندامین جێبەجێ بکرێن (Episiotomy technique principles)

- پەیڕەویکردن لە سیاسەتی بەکارهێنانی سنووردار/هەڵبژاردەیی بۆ ئەنجامدانی دادڕینی بندامین لە ناوەڕاستەوە بۆ لاتەنیشت.
- دادڕینی بندامین ئەنجام دەدرێت لە کاتی دەرکەوتنی تەپڵەی سەری کۆرپەلە (crowning of fetal head).
- پێویستە بە شێوەیەکی کاریگەر و تاقیکراوە سڕکەری ئازار دابین بکرێت لە پێش ئەنجامدانی دادڕینی بندامین، بێجگە لە حاڵەتەکانی ئیمێرجینسی بە هۆی شپرزەیی سەختی کۆرپەلە (acute fetal compromise)
- تەکنیکی دادڕینی بندامین بەشی خۆی مەترسیی برینداربوونی ماسولکەی بەیەکهێنەری کۆمی لەگەڵدایە.
- باش دەزانرێت کە گۆشەی بڕین بە شێوەیەکی بەرچاو گەورەترە لە گۆشەی تەقەڵدانی لە دواییدا، ئەمەیش بە هۆی کشان و ئاوسانی شانەکان.
- دەبێت مەقەسی تیژ بەکار بهێنرێن (Queensland Clinical Guidelines, 2018).
- مەقەسی دادڕینی بندامین (وەك مەقەسی چەماوەی پلە ٦٠ (Episcissors)) بە تایبەتی دروستکراوە بۆ بڕین بە گۆشەی ٦٠ پلە، دەکرێت کاریگەر بێت بۆ بەدەستهێنانی گۆشەیەکی دروست کە مەترسی برینداربوونی ماسولکەی بەیەکهێنەری کۆم کەمبکاتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، پێشنیار دەکرێت توێژینەوە ئەنجام بدرێت بۆ چارەکردنی گومانەکانی تایبەت بە کارامەیی و سەلامەتی لە بەکارهێنانی مەقەسی چەماوەی پلە ٦٠ (NICE, 2020).

### گۆشەی برین (Angle of incision)

هیچ کۆدەنگییەك نییە لەسەر گۆشەیەکی نمونەیی بۆ دادڕینی بندامێن لە ناوەڕاستەوە بۆ لاتەنیشت.

- پێشنیار و راسپاردەکانی باشترینی ڕێکخراوە پیشەییەکان گۆشەکە لە هێڵی ناوەڕاستەوە بە پلەی نێوان ٤٥ بۆ ٦٠ پلە دادەنێن.
- برینی دادڕینی بندامێن لە ناوەڕاست بۆ لاتەنیشت بە گۆشەی ٦٠ پلە لە هێڵی ناوەڕاستەوە لە کاتی دەرکەوتنی تەپڵە سەری کۆرپەڵەکە دەبێتە گۆشەی ٤٥ پلە لە دوای چاککردنەوەی (کەمتر نابێت لە گۆشەی ٤٥ پلە)، تەماشای شێوەی ژمارە ١ بکە.
- برینەکە لە فۆرشیتی زێ (لێواری خوارەوەی دەمی زێ) دەست پێدەکات و بە گشتی بەرەو لای راست ناراستە دەکرێت (Queensland Clinical Guidelines, 2018; Barjon and Mahdy, 2019).




شێوەی ١. شێوازی ئەنجامدانی دادڕینی بندامێن لە ناوەڕاستەوە بۆ لای راست. وەرگیراوە لە (*RCOG (2020)*)

## تەقەڵی تواوەی بەردەوام بەرانبەر بە تەقەڵی پچڕپچڕ بۆ چاککردنەوەی دادڕینی بندامێن

وەك پێشتر باس کرا، ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی (WHO 2018a) رایدەگەیەنێت کە تەکنیکی تەقەڵی بەردەوام بە پەسەندتر دەزانرێت تا تەقەڵی پچڕپچڕ. پێداچوونەوەیەکی ڕێکخراوی کۆکرەین (Cochrane) کە لەلایەن کێتڵ (Kettle) و کەسانی دیکە لەساڵی (2012) ئەنجام دراوە هەڵسەنگاندنی کرد بۆ کاریگەرییەکانی نێوان تەقەڵی تواوەی بەردوام و تەقەڵی تواوەی پچڕپچڕ کە بەکار دەهێنرێت بۆ چاککردنەوەی دادڕینی بندامێن (episiotomy) و دڕانی بندامێن (perineal tears) بە پلەی دووەم لە دوای منداڵبوون. شانزە تاقیکردنەوەی هەڕەمەکی ئەنجام درا کە (٨،١٨٤) ئافرەتی لەخۆ گرتبوو. شیکاریی هەموویان ئەوەی دەرخست کە تەکنیکەکانی تەقەڵدانی بەردەوام بە بەراورد بە تەقەڵدانی پچڕپچڕ بۆ داخستنی بندامێن (گشت چینەکان یان تەنها پێستی بندامێن) پەیوەستن بە ئازاری کورتخایەنی کەمتر و، کەمکردنەوەی گشتیی بەکارهێنانی سڕکردن و کەمکردنەوەی دەرهێنانی تەقەڵەکان. هەروەها، هەندێ بەڵگە هەن لەسەر کەمیی بەکارهێنانی ماددەی تەقەڵدان کە لە تەکنیکی بەردەوامدا بەکار دەهێنرێن بە بەراورد بە تەکنیکە پچڕپچڕەکان.

## تەکنیکی تەقەڵدانی گرێنەدراوی بەردەوام (Continuous non-locking technique)

ئەمە تەکنیکێکی سێ قۆناغییە (تەماشای شێوەی ژ. ٢ بکە): "چاککردنەوەکە بە تەقەڵێکی لەنگەری (تەقەڵێکی سەرەتا) لە سەرەوەی دڕانەکەی زێ دەست پێدەکات و شانە قووڵەکان و پەردەی (*mucosa*) دادەخرێنەوە بە یەك تەقەڵی گرێنەدراوی بەردەوام، بە پێچەوانەی تەقەڵی گرێدراو کە بۆ شێوازە تەقلیدییەکان بەکار دەهێنرێت. ئینجا ماسولکەکانی بندامێن (*perineal muscles*) لەیەك نزیك دەکرێنەوە بە هەمان تەکنیکی گرێنەدراوی بەردەوام و چاککردنەوەکە بە تەقەڵێکی بەردەوامی تەواو دەکرێت کە بە باشی دەبرێتە بن ڕووی پێست تا چینی فاشیای ژێر پێست (*subcutaneous fascia*). تەقەڵی تەواوکراو بە گرێیەك کۆتایی پێ دەهێنرێت کە دەخرێتە ناو زێ لە پشتەوەی پاشماوەکانی پەردەی کچێنی. داوێکی

درێژی تەقەڵ کە دەکرێت بتوێتەوە بەکار دەهێنرێت بۆ چاککردنەوەکە بە بێ گرێدان جگە لە گرێی سەرەتا و کرێی کۆتایی .(Kettle et al, 2012, p3) "




شێوەی ٢. تەکنیکی تەقەڵدانی بەردەوام. وەرگیراوە لە ((Webb et al. (2014)

**چاککردنەوەی دڕانی بندامێن (Repairing perineal tears)**

چارەکردنی دڕانی بندامێن چەند جۆری هەیە بە گوێرەی سەختی برینەکە و لە خشتەی ژمارە ١ روون کراوەتەوە.

خشتەی ژمارە ١: چارەکردنی دەستبەجێی دڕانی بندامێن (perineal tears)

| | |
|---|---|
| پلەی یەکەم | ئەم دڕانانە بە برین و دڕانی بچوك دادەنرێن و بەجێ دەهێڵدرێن بۆ بڕیاری پزیشك داخۆ پێویست بە تەقەڵدان دەکات یان نا. |
| پلەی دووەم | ئەگەرچی ئەم برینانەش سووکن، بەڵام دەبێت تەقەڵ بدرێن بۆ ئەوەی برینەکە باشتر بێتەوە یەك (چونکە سوودی بەرچاوی دەبێت بۆ هەفتەی دوای منداڵبوونەکە). |
| پلەی سێیەم و پلەی چوارەم | بە بەکارهێنانی سڕکەری جێگەیی یان گشتی، ئەم دڕان و برینانە دەبێت بە زووترین کاتی گونجاو و بە شێوەی نەشتەرگەری چاك بکرێنەوە، بۆ ئەوەی یارمەتی حەسانەوەی ماسولکەی بەیەکهێنەری کۆم بدات. دەبێت نەشتەرکاری ڕاهێنراو ئەم چاککردنەوەیە ئەنجام بدات چونکە حاڵەتەکانی ڕانەگیرانی کۆم دەبێت لە ئەنجامی کاری کەسانی بێ ئەزموون بن. وەرگیراوە لە (Goh et al., 2018) |

بێ ڕەچاوکردنی ڕادەی سەختیی دڕانەکە، ئەم بنەمایانەی خوارەوە دەبێت لە کاتی چاککردنەوەکەدا بەکار بهێنرێن:

- نەشتەرکارێکی بەئەزموون، نەشتەرکارێك کە ڕاهێنراوی مامانی/منداڵبوون بێت، دەبێت چاککردنەوەکە تەواو بکات.
- ڕۆشنایییەکی باش و توانای دەست پێگەیشتن زۆر گرنگن - بە شێوەیەکی نموونەیی دەبێت کارەکە لە هۆڵی نەشتەرگەری ئەنجام بدرێت و نەخۆشەکە لەسەر پشت و لاقی بەرزکراو (lithotomy position) بێت.
- بە ئەندازەی پێویست سڕکەری جێگەیی (anaesthesia) دەبێت بەکار بهێنرێت.
- دەبێت هەموو چینێك بە جیا چاك بکرێتەوە بۆ ئەوەی دوایی کاری خۆی بکات.
- دەبێت چاککردنەوەکە بە ئاراستەی لە سەرەوە بۆ خوارەوە ئەنجام بدرێت چونکە بەم شێوەیە دەستەبەری ئەوە دەکات دەست بگات بە شوێنەکانی سەرەوە و ڕێگەیان نەگیرێت.
- دەبێت تەقەڵی شیاوی توانەوە بەکار بهێنرێت و گرێکانی هەموو چینێکیش بشاردرێنەوە چونکە بەم شێوەیە مەترسییەکانی ئازاری سەرجێیی (dyspareunia) و ناڕەحەتییەکانی زێ لە دوای ساڕێژبوونەوە کەم دەکاتەوە (Goh et al., 2018).

## ڕێگاچارەکانی پاش نەشتەرگەریی دڕانەکانی بندامێن

<u>ئانتیبایۆتیك/دژەبەکتریا (Antibiotics)</u>

بۆ ئەوەی مەترسییەکانی هەوکردن و کرانەوەی برین کەم ببێتەوە، ئانتیبایۆتیکە مەودا فراوانەکان پێشنیار دەکرێن بۆ ماوەی ڕاستەوخۆی دوای نەشتەرگەرییەکە (Goh et al., 2018).

## دەرمانی سڕکەر (ئازارشکێن)

دەبێت کیسەی سارد بە شێوەیەکی نمونەیی هەر ۱۰-۲۰ خولەك جارێك و بۆ ماوەی ۲٤-۷۲ کاتژمێری دوای نەشتەرگەرییەکە بەکار بهێندرێت. دەکرێت پاراستۆل و دەرمانی دژە هەوکردنی ناستیرۆیدی بەکار بهێندرێت. لەگەڵ ئەوەشدا، دەبێت ماددە بێهۆشکەرەکان (opioids) سنووردار بکرێت بۆ ئەوەی مەترسیی قەبزی کەم ببێتەوە. دەرمانی قلیەییکردنی میز (urinary alkaliniser) دەتوانێت یارمەتیدەر بێت بۆ کەمکردنەوە نارەحەتی لەکاتی میزکردندا (Goh et al., 2018).

## دەرمانی ڕەوانی یان نەرمکەرەوەی پیسایی (Laxatives or stool softeners)

پێشنیاری دەرمانی ڕەوانی دەکرێت بۆ پاش چاککردنەوەی بندامێن چونکە تێپەڕینی پیسایی دەبێتە هۆی کردنەوەی برینەکە. دەرمانی نەرمکەرەوەی پیسایی وەك لاکتولۆز (lactulose) بۆ نزیکەی ۱۰ ڕۆژی دوای نەشتەرگەرییەکە پێشنیار دەکرێت. نەرمکەرەوەی پیسایی دەبێت بە پێوانە و ئەندازە بێت بۆ ئەوەی پیساییەکە بە نەرمی بهێڵێتەوە، نەك شل و زەحیری بکات (Goh et al., 2018).

## دۆخی دانیشتن و جووڵان (Positioning and movement)

لە ماوەی ٤٨ کاتژمێری یەکەمی دوای نەشتەرگەرییەکە، نەخۆشەکە دەبێت ئەو دۆخانەی دانیشتن و پاڵکەوتن بە خۆی بدات کە مەترسیی ئاودزکردنی بندامێن کەم دەکاتەوە. لەم شێوە دۆخانەش بریتییە لە پاڵکەوتن لەسەر جێخەوێکی/قەرەوێڵەیەکی تەخت لە کاتی پشوودانداو، پاڵکەوتن لەسەر لاتەنیشت لە کاتی شیرداندا و، بەدووربوون لە زۆر دانیشتن. هەروەها نەخۆشەکە دەبێت خۆی بەدوور بگرێت لەو چالاکییانەی کە دەبنە هۆی پەستانی ناو سك بۆ ماوەی شەش تا ۱۲ مانگی دوای منداڵبوونەکە (Goh et al., 2018).

مەشقی ماسولکەکانی خوارووی حەوز (Pelvic floor exercises)

مەشقی خوارووی حەوز دەبێت لە دوو تا سێ ڕۆژی دوای نەشتەرگەرییەکە دەست پێبکات، یان لە هەر کاتێك کە نەخۆشەکە هەست بە ئاسوودەیی بکات. ئەو نەخۆشانەی برینی/دڕانی پلە سێ یان پلە چواری بندامێنیان هەیە دەبێت هەوڵەی پسپۆری چارەسەری سروشتی بکرێن کە شارەزاییان هەیە لە بواری بندامێن، ئەویش دەتوانێت غازات و مەترسییەکانی ڕانەگیرانی پیسایی و میز کەم بکاتەوە (Goh et al., 2018).

چاودێریکردنی برین (Wound care)

دڵنیابوونەوە لەوەی کە برینەکە لە دوای چوونە سەرئاو دەشۆرێت و ووشك دەکرێتەوە. نەخۆشەکە دەبێت ڕۆژانە تەماشای برینەکە بکات بە بەکارهێنانی ئاوێنەیەکی دەستی نەبادا هیچ ئاماژەیەکی کرانەوەی برینەکە هەبێت (Goh et al., 2018).

ڕێگریکردن لە زامداری سەختی ئەندامی زاوزێ

کۆلێژی شاهانەی مامانی بەریتانی (RCM, 2018) ڕایگەیاند کەوا بەڵگەیەکی باش هەیە کە بەکارهێنانی پارچەیەکی (خاولییەکی) گەرم لەسەر بندامێن و، هەندێ بەڵگەش هەن کە مەساجکردنی بندامێن لە کاتی لەدایکبووندا یارمەتیدەر دەبن لە کەمکردنەوەی ڕێژەی دڕانەکانی پلەی سێیەم و چوارەم.

بەهەمان شێوە، ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی پێشنیاری ئەم تەکنیکانەی خوارەوە دەکات بۆ کەمکردنەوە زامداری (برینی سەختی) بندامێن و بۆ ئاسانکردنی منداڵبوونی سروشتی بۆ ئەو ئافرەتانەی لە قۆناغی دووەمی ژانگرتندان: دانانی پارچەی گەرم، مەساجی بندامێن و چاودێریکردن لەگەڵ "دەستتێوەردان" (Hands-on) لەسەر بندامێن. ئەم تەکنیکانە بە پێی ویستی ئافرەتەکە و بە پێی بژاردە بەردەستەکان ئەنجام دەدرێن. زۆربەی ئافرەتان ئەم تەکنیکە نرخ هەرزانانە پەسەند دەکەن و ئەو دەرەنجامەیشی لەسەریان هەیەتی بەرز هەڵدەسەنگێنن (WHO, 2018c). لەگەڵ ئەوەشدا، سەبارەت بە ڕێژەی دڕانی پلە سێ و چوار، بەڵگەیەکی کوالێتی نزم هەیە کە دەست بەکارنەهێنان (Hands-off) بە بەراورد بە

تەکنیکەکانی دەستتێوەردان (Hands-on) هیچ کاریگەرییەکی نابێت لەسەر ڕێژەی دڕانی پلە سێ و چوار بەڵام ڕەنگە کەمتر بێت لەو ئافرەتانەی کە پێویستیان بە دادڕینی بندامێن (episiotomy) دەبێت وەك لەسەرەوە باس کرا (RCM, 2018).

لەگەڵ ئەوەشدا، بە ئەندازەی پێویست بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی دەربیخات داخۆ شێوازی ریتگنز (Ritgen's maneuver) (بە بەکارهێنانی دەستێك بۆ ڕاکێشانی چەناگەی کۆرپەڵەکە لە نێوان کۆم و کلێنچکەی دایکەکە و، ئەو دەستەکەی دیکەی دەخرێتە سەر پشتەسەری کۆرپەڵەکە بە مەبەستی خێراترکردنی لەدایکبوونەکە) یان هەر تەکنیکێکی دیکەی تایبەت بە بندامێن کە بتوانێت ئەنجامی باشتری هەبێت. لەبەر ئەمەش، ئەم تەکنیکانە پێشنیار ناکرێن (RCM, 2018; WHO, 2018c).

بەڵگەیەکی کوالیتی نزم هەیە کە دادڕینی بندامێن بە شێوەی هەڵبژاردەیی ( selective episiotomy) بۆ منداڵبوونی سروشتی بێ یارمەتیدان لە ڕێگەی زێوە، ئەنجامی وەهایە کە ژمارەیەکی کەمتری ئافرەتان تووشی برینی سەختی زێ یان بندامێن دەبن بە بەراورد بە دادڕینی ڕۆتینی (RCM, 2018).

**ڕاسپاردەکان بۆ ئەنجامدان** (Recommendations for practice)

بەڵگەیەکی باش هەیە بۆ ئەم پێشنیارانەی خوارەوە:

- دانانی پارچەیەکی گەرم لەسەر بندامێن دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی دڕانی بندامێن لە پلەی سێ و چوار. مامانەکان دەبێت لە ئافرەتەکە بپرسن داخۆ حەز دەکەن پارچەی گەرمیان بۆ دابنرێت لەسەر بندامێنیان تاوەکو یارمەتییان بدات لە کەمکردنەوەی مەترسییەکانی برین و دڕانی سەخت (RCM, 2018). ئەم بە کارە بە خوساندنی پارچە قوماشێك (یان فانیلەیەك) لە ناو ئاوی گەرمدا (لە نێوان ٤٥-٥٩ پلەی سیلیزی) ئەنجام دەدرێت، کە دەگوشرێت و ئینجا بە هێواشی دەخرێتە سەر ناوچەی بندامێن. ئەمەش دەتوانێت لە بەشی کۆتایی قۆناغی دووەمی منداڵبوون کەڵکی لێ وەربگیرێت کاتێك کە سەری کۆرپەڵەکە دەست دەکات بە فراوانکردنی ناوچەی بندامێن (Seddon, 2019).

- بەڵگەكان پێشنیاری ئەوە دەکەن کە مەساجی بندامێن رەنگە شانسی ئەوە زیاتر بکات بندامێن بە سەلامەتی بمێنێتەوە و مەترسییەکانی دڕانی سەختی بندامێن کەم بکاتەوە (WHO, 2018c). تەماشای "رێنماییەکانی مەساجی بندامێن" بکە.
- شێوازی "دەستتێوەردان" (hands-on) (چاودێریکردن) لەوانەیە دڕانی پلەی یەکی بندامێن کەم بکاتەوە. ئەم تەکنیکە ئەوەش دەگرێتەوە کە مامانەکە بە هەردوو دەستی پاڵپشتی و پارێزگاری بکات لە بەشی پێشەوە و پاشەوەی بندامێن و کرانەوەکەی دەرچوونی سەری کۆرپەڵەکە بپارێزێت و کۆنترۆڵی بکات. (WHO, 2018c)
- بەڵگە لەسەر شێوازی ریتجین (Ritgen's manoeuvre) زۆر مسۆگەر نییە، بۆیە پێشنیار ناکرێت (WHO, 2018c).

**رێنماییەکانی مەساجی بندامێن**

وەها پێشنیار دەکرێت کە مەساجی(شێلانی) پێش منداڵبوون لە هەفتەی ٣٤ی دووگیانییەوە دەست پێبکرێت. تەنها ئەو کاتە سوودی دەبێت کە هەفتانە دوو جار و هەر جارێك بۆ ماوەی ٥-١٠ خولەك ئەنجام بدرێت. شێلانی ناوچەی بندامێن بە رێژەی زیاتر لەم پێشنیارە سوودی کەم دەبێتەوە بۆ پاراستنی. (Oxford University Hospitals, 2017; Mater Mothers' Hospital, 2018; Seddon, 2019).

<u>هەنگاوەکان</u>

- مێزەڵدان بەتاڵ بکە، دەستەکانت بشۆ و نینۆکەکانی پەنجەت بە کورتی بهێڵەوە.
- لە شوێنێکی تایبەتدا ئیسراحەتی خۆت وەربگرە، بە جۆرێك دابنیشە کە ئەژنۆکانت بۆ سەرەوە بچەمێنەوە، بە پشتدا لەسەر چەند بالیفێك پاڵ بدەوە بۆ پشتیوانی پشتت ئەگەر وەهات پێ خۆش بێت. دەکرێت سوودبەخش بێت ئەگەر لە دوای خۆشۆردن یان چوونە سەر ئاو ئەنجام بدرێت.

- ماددەیەکی چەورکەر بەکار بهێنە وەك زەیتی زەیتون یان زەیتی گوڵەبەڕۆژە (پێویستە خۆت بەدوور بگریت لە زەیت یان رۆنی دروستکراو).
- هەردوو یان یەك پەنجە گەورەت دوای چەورکردنی بۆ قووڵایی ۱ یان ۱.٥ ئینچ ببە ناو زێت (ناو دامێنت).
- بۆ خوارەوە بەرەو کۆم و بۆ لاتەنشیتەکان پاڵ بنێ و پەنجە گەورەت بۆ ماوەی ۱ تا ۲ خولەك رابگرە تاوەکو هەست بە نەرمە کشانێك دەکەیت.
- بە یەك یان هەردوو پەنجە گەورەت بە هێواشی مەساجی بەشی خوارەوەی ناو زێت بکە بە جووڵەیەك بە شێوەی پیتی u، لەگەڵ ئەوەشدا سەرەنجت لەسەر ئیسراحەت و ئاسوودەیی بێت.
- لە کاتی مەساجکردنەکەدا، تا دەتوانیت سەرنج بخەرە سەر ئاسوودەیی و نەرمبوونەوەی ناوچەی بندامێنت (تەماشای شێوەی ۳.٥ بکە) ( Oxford University Hospitals, 2017; Mater Mothers' Hospital, 2018; .(Seddon, 2019



شێوەی ژمارە ۳. تەکنیکی مەساجی بندامێن. وەرگیراوە لە ( Mater Mothers' (Hospital (2018)

**ڕێنماییەکانی ئەنجامنەدان**

مەساجی بندامێن نابێت لەم دۆخانەی خوارەوەدا ئەنجام بدرێن:

- لە پێش هەفتەی ٣٤ی دووگیانی.
- پزدانگی (placenta previa) سەر ڕێ یان هەر دۆخێکی دیکە کە خوێنڕێژیی لەگەڵدا بێت لە زێوە لە کاتی نیوەی دووەمی ماوەی دووگیانی.
- تامیسکەی (ناگرەی) زێ (herpes)، کەڕووی زێ (thrush) یان هەر هەوکردنێکی دیکەی زێ، چونکە مەساج لەم حاڵەتانەدا دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی هەوکردنەکە و خراپتربوونی حاڵەتەکە (Oxford University Hospitals, 2017; Mater Mothers' Hospital, 2018; Seddon, 2019).

**دەرەنجامەکان**

ئامانجی ئەم بەشە ئەوە بوو نوێترین زانیاری بە خوێنەران ببەخشێت سەبارەت بە ئەنجامدانی کردەی دادڕینی بندامێن بە پشتبەستن بە بەڵگە و بە ڕێنماییە پێوەرییەکان. زۆربەی بەڵگەکان پشتیوانی لەوە دەکەن کە بەکارهێنانی ڕۆتینییانەی دادڕینی بندامێن هیچ سوودێکی نابێت و بەم هۆیەش ڕێکخراوە گەورەکانی تەندروستیی وەك (WHO) پێشنیاری "بەکارهێنانی دادڕینی بندامێن بە شێوەیەکی زۆر و ڕۆتینییانە" ناکەن بۆ ئەو ئافرەتانەی کە خۆیان لە ڕێگەی زێوە منداڵیان دەبێت. هەندێ دامەزراوەی دیکەی تەندروستی پێشنیاری بەکارهێنانی هەڵاوێردکراو/سنوردارکراوی دادڕینی بندامێن دەکەن و، لەو حاڵەتانەشدا کە کردەی دادڕینی بندامێن دەستنیشان دەکرێت، ئەوا تەکنیکی لە ناوەڕاستەوە بۆ لاتەنیشت پێشنیار دەکرێت، ئەمەیش لەگەڵ ئەوپەڕی ڕەچاوکردنی ئاست و پلەکەی. هەروەها، ئەگەرچی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی پێشنیاری ئەوە دەکات کە ئانتیبایۆتیکی خۆپارێزی بەکار بهێنرێت بۆ ئەو حاڵاتانەی کە برینی دادڕینی بندامێن بەرەو ئاستەکانی سێیەم یان چوارەمی درانی بندامێنی تەشەنە دەکات، ئانتیبایۆتیکە پارێزەرە ئاساییەکان پێشنیار ناکرێت بۆ هەموو ئافرەتێك کە دادڕینی بندامێنی بۆ ئەنجام دەدرێت.

## بەشی پێنجەم

# ڕێنماییەکانی تایبەت بە چاودێریکردنی بندامێن بۆ دایکان لەلایەن تەندروستکاران

د. نەڤین فتاح حاجی مام

**پێشەکی**

ئەو ماوەیەی کە ئافرەتان دەگەڕێنەوە باری پێش منداڵبوون پێی دەگوترێت ماوەی پاش زاییمانی (یان ماوەی زەیستانی) کە زۆر گرینگە ئافرەتان لەو ماوەدا چارەسەری پێویستیان بۆ بکرێت لە ئەگەر لە کاتی منداڵبوونەکە تووشی هەر برینداربوونێکی بندامێن (ناوچەی زێ) هاتبێت. (Kettle & Tohill 2008; MEHT 2017).

برینداربوونی بندامێن دەکرێت ببێتە هۆی زامداری/تراوما و ئەمەش بە شێوەی ئەرێنی کار بکاتە سەر ئافرەتان لە رووی شیردانی دایکەکە، باری جەستەیی و دەروونی و کۆمەڵایەتیی دایکەکە لە سەرەتای ماوەی زەیستانییەکەی و هەروەها بۆ ماوەیەکی درێژخایەنیش (Fitzpatrick & O'Herlihy 2007; Kettle & Tohill 2008). ئەمەیش دەکرێت ماوەیەکی ناخۆش و پڕ زەبر بێت و لەوانەشە کار بکاتە سەر چالاکییە هەمیشەییە ئاساییەکانی وەك رۆیشتن، دانیشتن، چەمانەوە یان بە چیچکە دانیشتن، بەکارهێنانی ئاودەست (میزکردن / پیساییکردن)، ئەنجامدانی چالاکی سێکسی، شیردان، هتد. ئەو دەستپێشخەری و چارەسەرانەی کە دەبنە هۆی کەمکردنەوەی سەختیی برینداربوون/زامداری بندامێن (بە کاریگەرییە کورتخایەن و درێژخایەنەکانی دایك) ئەوکات زۆر پێویست دەبن ( Kettle and Tohill, 2008).

محمد و ئەل ئاگەر (٢٠١٢) بە پشتبەستن بە دەرئەنجامی توێژینەوەکانیان بەوە گەیشتن ئەو ئافرەتانەی کە خۆیان چاودێریی بندامێنیان وەرگرتووە و ئەنجام داوە لە ماوەی دوای منداڵبوونەکەیان، ئەوا: (i) تووشی ئازاری کەمتر دەبن، (ii) هەنگاوەکانی سارێژبوونەوەی برینەکانیان باشتر دەبێت و، (iii) کەمبوونەوەی ئەو ئازارانەی پەیوەستن بە کردنەوەی/دادڕینی بندامێن بە یارمەتی هەندێ چالاکیی وەك رێکردن، دانیشتن، میزکردن، پیساییکردن و هتد. بەم شێوەیە، ئەوان پێشنیاری رێنماییە خودییەکانی تایبەت بە چاودێریکردنی بندامێن دەکەن بۆ ئافرەتان لە قۆناغی پێش منداڵبوونیاندا بۆ ئەوەی لە دوای منداڵبوون خۆیان بەکاری بهێنن و ئەو رێنماییە خودییانەی چاودێریکردنی بندامێن پێویستە پێشکەش بە پسپۆرانی چاودێری تەندروستی وەك ئەو پەرستار و مامانانە بکرێت کە چاودێری پاش منداڵبوون پێشکەش دەکەن.

